# الرد على من يقول القرآن مخلوق

به‌كوردی

نوسینی

أَبُو بَكْر أَحْمَد بْن سلمان بْن الْحَسَن بْن إسرائيل بْن
يونس النجاد
المتوفى السنة [٣٤٨هـ]

وه‌رگێڕانی

أَبُو خَيْثَمَةَ الْحَنْبَلِي

# الرد على من يقول القرآن مخلوق

به‌كوردی

نوسینی

أَبُو بَكْر أَحْمَد بْن سلمان بْن الْحَسَن بْن إسرائيل بْن
يونس النجاد
المتوفى السنة [٣٤٨هـ]

وه‌رگێرانی

أَبُو خَيْثَمَةَ الْحَنْبَلِي

# پێشەكی



بسم الله والحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه

أما بعد:

لەم سەردەمە پڕ فیتنە و موسیبەتەدا كە هەر ساڵێک دێت لەوەی پێش خۆی خراپتر دەبێت، هەر ساڵێک دێت دەبێتە هۆی نەمانی چەند سوننەتێک و سەرهەڵدانی چەند بیدعەو داهێنراوێک، فێربوون و شارەزابوونی موسوڵمان لە دینەكەی و سوننەت لە پێویستیەكانی ئەمڕۆیە و زامنی ڕزگاربونیەتی لە فیتنەی ئەم سەردەمەو و سەردەمانی پێشووشدا كە سەریان هەڵداوە،

وە یەكێک لە گەنجینەكانی ئەم دینەش كە گەوهەرێكی پڕ عیلم و زانستە كتێبی [الرَّدُّ عَلَى مَنْ يَقُولُ الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ]ـەی أبو بكر النجاد ـە، كە پێكدێت لە ١١٣ ئاثار ئەم كتێبە كە ناوی [ڕەددێک بۆ ئەو كەسەی دەڵێت قورئان مەخلوقە] زۆر بە پێز و فراوانترێكە كە وەک لە ناوەكەی دیارە و تەنیا وەڵامی ئەو كەسانە بداتەوە كە بڵێت قورئان مەخلوقە، بەڵكو ئاثارەكان بەگشتی ڕەددە بۆ هەموو جەهمییەكانی كۆن ئەشعەرییەكانی سەردەم،

بابەتەكانی ناوی خۆی دەبینێتەوە لە وەڵامدانەوەی ئەو كەسانەی كە دەڵێن قورئان مەخلوقە، كۆمەڵێک لە ناو سیفاتەكانی پەروەردگار عز وجل، وە بینینی اللهّ لەلایەن پێغەمبەری الله ﷺ، قسەكردنی موسى

عليه السـلام و كۆمەڵێک بابەتی تر لە پاڵ ئەم بابەتانەدا سـەلەف گرنگییەکی زۆریان بە بابەتی کوفری قورئان مەخلوقە داوە، وە حوکمیان داوە بەسەریاندا بەوەی تەکفیریان کردوون، و هەزاران وتەیان هەیە لە وەڵامی ئەو کەسەی بڵێت قورئان مەخلوقە، ڕەنگە کەسانێک بڵێن بۆوا توند بوون لەسەریان و ئەم هەموو ئاثار وکتێبە هەیە لەڕەددیان، بەڵام گەر لە بابەتەکە بکۆڵیتەوە و سـێری وتەی جەهمییەکان بکەیت بۆت دەرەکەویت چەن بە خراپی قسە لەسەر الله و سیفاتەکانی دەکەن، وە جەهمییەکان دەربارەی قورئان بوون بەسێ بەشەوە ئەوانیش:

١- مەخلوقییەکان [واتا: ئەو کەسانەن کە دەڵێن قورئان مەخلوقە]

٢-لەفزییەکان [واتا: ئەو کەسـانەی دەڵێن لەفز یاخود دەربڕینمان بە قورئان مەخلوقە]

٣-واقفییەکان [واتا: ئەو کەسانەی دەڵێن قورئان کەلامی اللّهّ ـیەو دەوەستن ناڵێن مەخلوق نییە]

کە وتەی هەر سـێ فیرقەکە یەک شـت ئەگرێتەوە ئەویش مەخلوقی قورئانە پەنا بە الله لەو کوفرە ناشرین و بێزراوە بەرامبەر الله، لە کاتێکدا لای ئەهلی سوننە قورئان کەلامی[وتەی] اللّهّ ـیەو مەخلوق[دروستکراو] نییە،

وە الله پاداشتی زانایانی ئەهلی سوننە بداتەوە کە هەر زوو ئاشکرا بوو بۆیان و وتەکانیان بەناوچاویاندا دانەوە و الله تەوفیقی دان بۆ پێکانی حەق، وە الله پاداشـتی گەورەکەمان أبا عبد الله أحمد بن حنبل بداتەوە کە کوفری جەهمییەکان و تایبەت هی لەفزییەکانی ئاشـکرا کرد و

پەردەی لابرد لەســەر کوفرە پیس و بێزراوەکـانیـان، پێموایە گەر لەم ســەردەمە ئەو وتـانە دەرکەوتنـایە دەگمەن کەســێک دەمـایەوە کە جەهمـی نەبـێ لەبەر فێڵـی جەهمییەکـان و پێچ و پەنـا پێـکردنـی کوفرەکەیان و ڕازاندنەوەی بۆ خەڵک، وە هۆکاری ئەوەی زۆر کتێبەکەم لەلا گرنگ بوو بۆ وەرگێڕانی بۆ کوردی بریتیبوو لە زۆربونی جەهمییەت و وتەکانیان و گرنگی بابەتە عەقیدەییەکانی ناو کتێبەکە چونکە خەڵکی زۆر بێ ئاگان لەم ئاثارانە و ئەهلی بیدەع هەڵساون بە زەعیف کردنیان بەهۆکاری ئەوەی لەگەڵ هەوا و ئارەزوەکانیان ناگونجێت یاخود لەگەڵ عەقڵیاندا ناگونجێت، وە ئەم کتێبە ڕیوایەتەکانی کە تێیدایە نوســەر لەســەرەتاوە تا کـۆتایی لە عبد الله ــی کـوڕی ئیمام أحمدەوە ئاثارەکان نقڵ دەکات و عبد الله بەسەر قوتابیەکانیدا خوێندویەتیەوە.



## ناساندنی نوسەری کتێبەکە



ناوی تەواوی نوسەر:

أبو بكر أحمد بن سلمان بن الحسن بن اسرائيل بن يونس البغدادي الحنبلي ناسراو به النجاد.

لینکی کەناڵ

https://t.me/islama_rebazman1

## لەدایک بوونی



لەهەموو سەرچاوەکان هاتووە کەوا لە ٢٥٣ لەدایک بووە، جگە لە السیوطي الأشعري دەڵێت لە ٢٥٠ لەدایک بووە، بەڵام ڕەئی یەکەم ڕای ڕاجح و کۆی سەرچاوەکانە.

## وەفات کردنی



الخطیب و ابن أبي یعلی دەربارەی دەڵێن لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا بینایی لەدەستداوە، وە ڕاجیاوازی نییە لەوەی لە مانگی ذي الحجة لە ساڵی ٣٤٨ وەفاتی کردووە، واتە ٩٥ ساڵ ژیاوە، تەنها حاجي خلیفة دەڵێت لە ٣٤٣ وەفاتی کردووە، وە ڕاجیاوازی هەیە دەربارەی ڕۆژی مردنی و شوێنی ناشتنی، ابن کثیر دەڵێت: لە شەوی جومعە لە ٢٠ ـی ذي الحجة وەفاتی کردووە، وە لەنزیکی بشر الحافي نێژراوە.



# ناوى مامۆستاكانى بەپێى كاتى وەفات كردنيان



١ - الحسن بن مكرم البزار ٢٧٤ ت

٢ - أحمد بن ملاعب المخرمي ٢٧٥

٣ – سليمان بن الأشعث [أبو داود السجستاني] ٢٧٥

٤ - يحيى بن أبي طالب جعفر بن الزبرقان ٢٧٥

٥ - محمد بن عبد الملك بن عبد الله بن محمد أبو قلابة الرقاشي ٢٧٦

٦ - أحمد بن أبي خيثمة ٢٧٩

٧ - محمد بن الهيثم أبو الأحوص العكبري ٢٧٩

٨ - جعفر بن محمد بن شاكر الصائغ

٩ - أحمد بن محمد البرتي ٢٨٠

١٠ - هلال بن العلاء الرقي ٢٨٠

١١ - محمد بن اسماعيل أبو اسماعيل الترمذي ٢٨٠

١٢ - محمد بن اسماعيل السلمي ٢٨٠

١٣ - أبو بكر بن أبي الدنيا ٢٨١

١٤ - اسماعيل بن اسحاق القاضي ٢٨٢

١٥ - الحارث بن أبي أسامة ٢٨٢

١٦ - جعفر بن أبي عثمان الطيالسي ٢٨٢

١٧ - محمد بن سليمان الباغندي ٢٨٣

١٨ - محمد بن غالب التمتام ٢٨٣

١٩ - ابراهيم بن اسحاق الحربي ٢٨٥

٢٠ - محمد بن يونس الكديمي ٢٨٦

٢١ - بشر بن موسى ٢٨٨

٢٢ - عبد الله بن أحمد بن حنبل ٢٩٠

٢٣ - محمد بن العباس المؤذن ٢٩٠

٢٤ - أبو مسلم ابراهيم بن عبد الله الكجي ٢٩٢

٢٥ - محمد بن عبدوس السراج ٢٩٣

٢٦ - محمد بن عبد الله مطين ٢٩٧

٢٧ - محمد بن عثمان بن أبي شيبة ٢٩٧

وە زیاتر لەمانیش.



# تەلەبەکانی



١ - ابن بطة

٢ - أبو بكر بن مردويه

٣ - أبو بكر بن عبد العزيز

٤ - أبو بكر بن مالك القطيعي

٥ - أبو جعفر العكبري

٦ - ابن حامد

٧ - أبو الحسن بن الفرات

٨ - الحسين بن عمر بن برهان الغزال

٩ - ابن رزقويه

١٠ - أبو سليمان الخطابي

١١ - أبو عبد الله الحاكم

١٢ - أبو عبد الله بن منده

١٣ - عبد الملك بن بشران

١٤ - ابن عقيل الباوردي

١٥ - علي بن بشران

١٦ - أبو علي بن شاذان

١٧ - علي بن عمر الدارقطني

١٨ - عمر بن أحمد ناسراو به ابن شاهين

١٩ - ابن الفضل القطان

٢٠ - أبو الفضل التميمي

٢١ - أبو القاسم الخرقي

٢٢ - أبو القاسم بن المنذر القاضي

٢٣ - محمد بن فارس بن الغوري

٢٤ - محمد بن يوسف أبو بكر الرقي

٢٥ - أبو نصر المقدسي ئەوكەسەى ئەم كتێبەى لە نوسەر ڕيوايەت كردووە

وە زياتر لەمانيش كە ئەگەر ناوى هەمويان بێنين زۆر درێژ ئەبێتەوە.



## كتێبەكانی



١ - الأمالي

٢ - جزء من الحديث

٣ - مجلس من أمالي

٤ - ذكر من الآيات ومن تكلم بعد الموت

٥ - الرد على من يقول القرآن مخلوق [ئەم كتێبەی لەبەردەستمانە]

٦ - السنن

٧ - الفوائد

٨ - الخلاف

٩ - مسند عمر بن الخطاب

بەشێک لە کتێبەکانی زۆر گەورە بوون وەک کتاب السنن و کتاب الخلاف.



## ستایش و پیاهەڵدانەکان لەسەری



الذهبي دەڵێت: ئیمامی فەرموودەناسی حافزە، زانا بووە بە ئوسوڵ و ئەحکامەکانی شەریعەت، وە موفتی بووە، شێخی عێراق بووە، وە دیوانێکی گەورەی لە سنن دا نوسیووە، وە کتێبێکیشی لە فیقهـ و ئیختیلافدا نوسیووە، هەروەها پێگەیەکی مەزنی هەبووە لە فیقهـ و گێڕانەوەی فەرمودەدا.

وە ابو الحسن بن رزقويه دەڵێت: النجاد ابن صاعدی ئێمەیە [ابن صاعد ڕاویەکی لێهاتوو زیرەک بووە]،

الخطیب دەڵێت: واتا النجاد بەهۆی زۆری حدیثەکانی و فراوانی لێهاتوییەکەی لە ئاماژەکردن و نوسراوەکانی، وە سودەکانی کە بەخشیویەتی بەوانەی گوێیان لێی گرتووە هاوشێوەی سودەکانی ابن صاعد بووە بۆ هاوەڵانی، وەکو ئەوەی هەر یەکێک لەو دوو: پیاوە یەک کەسبن لە کاتی خۆیاندا [بێگومان لە زیرەکی و لێهاتوییدا].

ابو اسحاق الطبري دەڵێت: النجاد بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژوو دەبوو، وە گشت شەوێک بە پارچە نانێک ڕۆژووەکەی دەشکاند، وە تیکەیەکی لەنانەکە دەهێڵایەوە، بەڵام لە شەوانی هەینیدا پارچە نانی بەشەکەی ئەکردە خێر و تیکەکانی کە هێڵاویەتیەوە ئەیخوارد.

ابو علي الصـــواف دەڵێـت: احمـد بن ســليمـان دەهـات بۆ لای فەرموودەناســەکان و نەعلەکانی لەناو دەســتیدا بوون، پێیان دەوت بۆچی نەعلەکانت لەپێ ناکەیت؟ دەیوت: حەزدەکەم بۆ داخوازیکردنم بۆ حەدیثی رسول اللّه ﷺ بە پێی پەتی ڕێگاکە ببڕم.

أحمد بن عبد الله الحربي دەڵێت: بيســتم أبا بكر أحمد بن ســلمان النجاد دەیوت: هەرکەســێک دان بنێت بە خەڵکیدا هاوڕێی کەم ئەبیت، وە هەرکەســێک دان بنێت بە تـاوانەکـانیـدا گریـانی درێژ ئەبێتەوە، وە هەرکەسێک دان بنێت بە خواردنەکانیدا برسێتی زۆر ئەبێت.

وە أبو بكر الخطيب دەڵێت: النجاد کەســێکی زاناو ڕاســتگۆ بووە، وە السنن ـــی نووسی، وە لە مزگەوتی منصور (کۆڕی) هـــەبـــووە پێش جومعە بۆ فتوا، وە (کۆڕی) هەبووە دوای جومعە بۆ نوسینەوە و ئیملا.



١ - ثَنَا ابو بكر احْمَد بن سـلمَان الْفَقِيه النجاد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَهْدِيٍّ يَقُولُ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُكَلِّمْ مُوسَى بْنَ عِمْرَانَ، يُسْتَتَابُ فَإِنْ تَابَ والا ضربت عُنُقه.

١ - عبدالرحمن بن مهدي دەڵێت: هەرکەسێک پێی وابێت کە الله قسەی لەگەڵ موسى بن عمران نەکردووە، ئیستیتابەی پێ ئەکرێت کردی باشە نەیکرد لە ملی ئەدرێت.

٢ - قَالَ ثَنَا احْمَد، ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي رَحِمَهُ اللَّهُ قَالَ: ثَنَا سُرَيْجُ بْنُ النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ يَقُولُ: الإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، وَيَقُولُ وَكَلَّمَ اللَّهُ عزوجل مُوسَى، وَقَالَ مَالِكٌ اللَّهُ فِي السَّمَاءِ وَعِلْمُهُ فِي كُلِّ مَكَانٍ لايخلومنه شَيْء.

٢ - عبد الله بن نافع دەڵێت: مالک بن أنس دەیوت: ئیمان وتەو کردەوەیە.

وە دەیوت: الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسى کردووە.

وە مالک دەیوت: الله لە ئاسمانە و عیلمەکەی لەهەموو شوێنێکە، هیچ شوێنێک خاڵی نییە لە عیلمەکەی.

٣ - قَالَ انبأ احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبِي عَنْ قَوْمٍ يَقُولُونَ: لَمَّا كَلَّمَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ مُوسَى لَمْ يَتَكَلَّمْ بِصَوْتٍ؟ قَالَ أَبِي: تَكَلَّمَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى بِصَوْتٍ وَهَذِهِ أَحَادِيثُ نَرْوِيهَا كَمَا جَاءَتْ، وَقَالَ أَبِي: حَدِيثُ ابْنِ مَسْعُودٍ: إِذَا تَكَلَّمَ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ يسمع لَهُ صَوت كمر سلسلة عَلَى الصَّفْوَانِ، قَالَ أَبِي: فَهَذَا الْجَهْمِيَّةُ تُنْكِرُهُ، وَقَالَ أَبِي: وَهَؤُلاءِ كُفَّارٌ، يُرِيدُونَ أَنْ يُمَوِّهُوا عَلَى النَّاسِ، مَنْ زَعَمَ أَنَّ اللّهَ لَمْ يَتَكَلَّمْ فَهُوَ كَافِرٌ، إِلا أَنَّا نَرْوِي هَذِهِ الأَحَادِيثَ كَمَا جَاءَت.

٣ - عبد الله بن أحمد دەڵێت: پرسیارم كرد لە باوكم دەربارەی كەسانێك كە ئەڵێن: كاتێك اللّه عزوجل قسەی لەگەڵ موسی كرد بە دەنگ قسەی لەگەڵدا نەكردووە؟

باوكم فەرمووی: تبارك وتعالی بە دەنگ قسەی كرد، ئەم حدیثانە دەگێڕینەوە وەك چۆن هاتوون،

وە باوكم فەرمووی: فەرموودەی ابن مسعود: كاتێك اللّه عز وجل قسە دەكات دەنگی دەبیستن وەك ڕاكێشانی زنجیرێكە لەسەر بەردێكی ساف دا،

باوكم فەرمووی: جا ئەمە جەهمییەكان ئینكاری لێ دەكەن،

وە باوكم فەرمووی: وە ئەوانە كافرن، دەیانەوێت سەر لە خەڵكی بشێوێنن، هەر كەسێك پێی وابێت كە اللّه عزوجل قسەی نەكردووە ئەوا كافرە، ئیلا من ئەم فەرموودانە دەگێڕینەوە وەك چۆن هاتوون.

٤ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِّ بْنُ احْمَد حَنْبَلٍ قَالَ: سَــمِعْتُ أَبَا مَعْمَرٍ الْهُذَلِيَّ يَقُولُ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ اللّه لايتكلم وَلا يَسْمَعُ وَلا يُبْصِرُ وَلا يَغْضَبُ وَلا يَرْضَــى وَذَكَرَ أَشْـيَاءَ مِنْ هَذِهِ الصِّــفَاتِ فَهُوَ كَافِرٌ بِاللّهِّ إِنْ رَأَيْتُمُوهُ عَلَى بِئْرٍ وَاقِفًا فَأَلْقُوهُ فِيهَا فَهَذَا دِينُ اللّه لانهم كفار.

٤ - عبـد الله بن أحمـد حنبـل دەڵێـت: بيســـتم له أبا معمر الهـذلي دەيووت: هەر کەس پێی وابێت کە الله عزوجل قسەناکات و نابیستێت و نابینێت و تورە نابێت و ڕازی نابێت -وچەند شـــتێکی تری باســـکرد لەو سـيفاتانە- ئەوە کافرە بە اللّه عزوجل ئەگەر بینیتان ڕاوەسـتابوو لەسـەر بیرێك ئەوا فڕێی بدەنە ناو بیرەکەوە ئەمە دینی الله ــيە چونکە ئــەوانە کافرن.

٥ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثني أَبِي قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمُحَارِبِيُّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْـــلِمٍ، عَنْ مَسْـــرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللّهِّ قَالَ: إِذَا تَكَلَّمَ اللّهُّ بِالْوَحْيِ يَسْـمَعُ صَـوْتَهُ أَهْلُ السَّـمَاءِ فَيَخِرُّونَ سُـجَّدًا حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ، قَالَ سَـكَنَتْ عَنْ قُلُوبِهِمْ نَادَى أَهْلُ السَّـمَاءِ: وَمَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: الْحَقَّ قَالَ كَذَا وَكَذَا.

٥ - عبد الله بن مسـعود دەڵێت: کاتێك الله عزوجل قسـە دەکات بە وەحی، ئەهلی ئاسـمان دەنگی دەبیسـتن، ئینجا دەکەون بە سـوجدەدا، هەتا کاتێك کە ترسەکە لە دڵیاندا دامرکایەوە،

وتى: له دڵیاندا دامرکایەوە، ئەهلى ئاسمان هەندێکیان بانگى هەندێکیان ئەکەن: پەروەردگارتان چى فەرموو؟
وتیان: حەق، ئاوا و ئاواى فەرموو.

٦ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: جَرِيرٌ عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: وَثنا ابْنُ نُمَيْرٍ وَأَبُو مُعَاوِيَةَ كُلُّهُمْ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ، عَنْ مَسْرُوقٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ، سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لَهُ صَلْصَلَةً كَصَلْصَلَةِ الْحَدِيدِ عَلَى الصَّفَا.
قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: قَدْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ بَعْضُ الشُّيُوخِ، عَنْ قُرَّانَ بْنِ تَمَّامٍ وَرَوَاهُ أَيْضًا أَبُو مُعَاوِيَةَ فَرَفَعَهُ مَرَّةً بِبَغْدَادَ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ مُسْلِمٍ عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ وَرَفَعَهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٦ - عبدالله بن مسعود دەڵێت: کاتێك الله قسە دەکات بە وەحى، ئەهلى ئاسمان گوێیان لە زرنگەکەى دەبێت وەك زرنگەى ئاسن لەسەر بەردێکى ساف.

أبو عبدالرحمن دەڵێت: ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت کراوە لە هەندێك لە شێخەکانەوە، لە قران بن تمام، وە هەروەها أبو معاوية جارێک ڕیوایەتى کردووە لە بەغداد بەمەرفوعى لە الأعمش، لە مسلم، لە مسروق، لە عبد الله، لە پێغەمبەر ﷺ.

٧ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَـيْبَةَ وَأَبُو مَعْمَرٍ قَالا: ثَنَا جرير، عَن يزيد، عَن زِيَادٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْحَارِثِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ بِالْوَحْيِ، سَمِعَ أَهْلُ السَّمَوَاتِ صَلْصَلَةً كَصَلْصَلَةِ الْحَدِيدِ فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ الأَعْمَشِ عَن مُسلم.

٧ - ابن عباس دەڵێت: كاتێك الله عزوجل قسـه دەكات بە وەحی، ئەهلی ئاسمانەكان گوێیان لە زرنگەكەی دەبێت وەك زرنگەی ئاسن.
جا باسی كرد بە هاوشێوەی فەرموودەكەی الأعمش لە مسلم ـەوە.

٨ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: ثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَرِيرُ بْنُ جَابِرٍ الْخَثْعَمِيُّ أَنَّهُ سَمِعَ كَعْبًا.

٩ - قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدُ اللَّهِ، وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدِ بْنِ حِسَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ ثَوْرٍ عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ جَرِيرُ بْنُ جَابِرٍ الْخَثْعَمِيُّ أَنَّهُ سمِعَ كَعْب الْأَخْبَار.

١٠ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: وَثنا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي ابو معمر قَالَ: ثَنَا ابو مُعَاذٍ وَأَبُو سُـفْيَانَ الْمَعْمَرِيُّ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَـامٍ، عَنْ جَرِيرِ بْنُ جَابِرٍ الْخَثْعَمِيُّ، أَنَّهُ سَـمِعَ

كَعْبًا يَقُولُ: كَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى كَلَّمَهُ بِالأَلْسِنَةِ كُلِّهَا قَبْلَ لِسَانِهِ فَطَفِقَ مُوسَى يَقُولُ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ مَا أَفْقَهُ هَذَا حَتَّى كَلَّمَهُ آخِرَ ذَلِكَ بِلِسَانِهِ مِثْلَ صَوْتِهِ فَقَالَ مُوسَى: هَذَا يَا رَبِّ كَلامُكَ؟ فَقَالَ اللّه عزوجل: لَوْ كَلَّمْتُكَ بِكَلامِي لَمْ تَكُنْ شَيْئًا أَوْ لَمْ تَسْتَقِمْ قَالَ: يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ يُشْبِهُ كَلامَكَ؟ قَالَ: لَا وَأَقْرَبُ شَبَهًا بِكَلامِي أَشَدُّ مَا يَسْمَعُ النَّاسُ مِنَ الصَّوَاعِقِ. وَالْحَدِيثُ عَلَى لَفْظِ أَبِي عَنْ عَبْدِ الرَّزَّاقِ.

١٠ - له جريز كوڕى جابر الخثعمى، كه گوێى له كعب بووه وتويەتى: الله قسەى لەگەڵ موسى كرد قسەى لەگەڵ كرد بە هەموو زمانەكان پێش زمانى خۆى، ئينجا موسى دەستى پێكرد وتى: ئەى پەروەردگار، ئەى پەروەردگارم لەمە تێناگەم.

هەتا لە ئاخيرى ئەمەدا قسەى لەگەڵ كرد بە زمانێك وێنەى دەنگەكەى.

ئينجا موسى عليه السلام ووتى: ئەمە قسەى تۆيە ئەى پەروەردگار؟

الله عزوجل فەرمووى: ئەگەر بێتو قسەت لەگەڵ بكەم بە قسەكەم ئەوا تۆ هيچ نەدەبويت يان نەتدەتوانى بەرامبەرى بوەستيت.

ووتى: ئەى پەروەردگار، ئايا هيچ شتێك هەيە لە دروستكراوەكانت لە قسەكردنت بچێت؟

فەرمووى: نەخێر، نزيكترين شتێك كە لە قسەى من بچێت توندترە لەوەى خەڵكى دەيبيستن لە هەورە تريشقەوە.

وە ئەم فەرموودەيە لەسەر لەفزى باوكمە لە عبدالرزاق ـەوە.

١١ - ثَنَا احْمَد، ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكَّارٍ قَالَ: ثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ: لِمُوسَى عَلَيْهِ السَّلامُ بِمَا شَبَّهْتَ صَوْتَ رَبِّكَ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: شَبَّهْتُ صَوْتَهُ بِصَوْتِ الرَّعْد حِين لايترجع تبَارك وَتَعَالَى.

١١ - محمد بن كعب دەڵێت: بەنی ئیسرائیل بە موسی علیه السلام یان وت: دەنگی پەروەردگارت عزوجل بەچی دەچوێنی؟
ووتی: دەنگی دەچوێنم بە دەنگی هەورە گرمە لەوکاتەی ناگەڕێتەوە تبارک وتعالی.

١٢ - ثَنَا احْمَد، ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَكَّارٍ قَالَ: ثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ، عَنْ أَبِي الْحُوَيْرِثِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاوِيَةَ قَالَ: مَكَثَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلامُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً لَا يراهُ أحْدُ الاماتَ مِنْ نُورِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

١٢ - أبی الحویرث عبدالرحمن بن معاویة دەڵێت: موسی علیه السلام چل دانە شـــەو مایەوە هیچ کەســـێك نەیدەبینی ئیللا دەمرد لەنوری پەروەردگاری جیهانیاندا.

١٣ - ثَنَا احْمَد، قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ بَكَّارٍ قَالَ: ثَنَا أَبُو مَعْشَرٍ، عَنْ أَبِي الْحُوَيْرِثِ قَالَ: إِنَّمَا كلم اللّه مُوسَى بعد مَا يُطِيقُ مُوسَى مِنْ كَلامِهِ فَلَوْ كَلَّمَهُ بِكَلامِهِ كُلِّهِ لَمْ يطقه شیء.

١٣ - أبی الحويرث دەڵێت: كاتێک الله قســەی لەگەڵ موســی كرد دوای ئەوەی موســی بەرگەی قســەكانی گرت، ئەگەر قســەی لەگەڵ بكردايە بە هەموو قسەكانی، بەرگەی هيچ شتێكی نەدەگرت.

١٤ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا الْحَسَنُ بْنُ حَمَّادٍ سَجَّادَةُ أَبُو عَلِيٍّ قَالَ: ثَنَا أَبُو مَالِكٍ عَمْرُو بْنُ هَاشِـم الجني، عَن جويبر، عَنِ الضَّـحَّاكِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ نَاجَى مُوسَـى بِمِائَةِ أَلْفِ كَلِمَةٍ وَأَرْبَعِينَ أَلْفَ كَلِمَةٍ فِي ثَلاثَةِ أَيَّامٍ، وَصَـايَا كُلُّهَا، فَلَمَّا سَـمِعَ مُوسَـى كَلامَ الآدَمِيِّينَ مَقَتَهُمْ، لِمَا وَقَعَ فِي مَسَـامِعِهِ مِنْ كَلامِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، فَكَانَ فِيمَا نَاجَاهُ) أَنْ قَالَ لَهُ: يَا مُوسَى إِنَّهُ لَمْ يَتَصَنَّعْ لِيَ الْمُتَصَنِّعُونَ بِمِثْلِ الزُّهْدِ فِي الدُّنْيَا، وَلَمْ يَتَقَرَّبْ إِلَيَّ الْمُتَقَرِّبُونَ بِمِثْلِ الْوَرَعِ عَمَّا حَرَّمْتُ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يَتَعَبَّدْ لِيَ الْمُتَعَبِّدُونَ بِمِثْلِ الْبكاء خِيفَتِي. قَالَ مُوسَـــى: يَا إِلَهَ الْبَرِيَّةِ كُلِّهَا، وَمَـالِـكَ يَوْمِ الـدِّينِ، وَيَـا ذَا الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ، مَـاذَا أَعْـدَدْتَ لَهُمْ؟ وَمَـاذَا أَجْزَيْتَهُمْ؟ قَالَ: أَمَّا الزَّاهِدُونَ فِي الدُّنْيَا فَأُبِيحُهُمْ جَنَّتِي يتبووون فِيهَا حَيْثُ شَـــاءُوا، أَمَّا الْوَرِعُونَ عَمَّا حَرَّمْتُ عَلَيْهِمْ فَإِنَّهُ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ لَمْ يَبْقَ عَبْدٌ إِلا نَاقَشْـتُهُ الْحِسَـابَ، وَفَتَّشْـتُهُ عَمَّا فِي يَدَيْهِ إِلا الْوَرِعِينَ فَإِنِّي أُجِلُّهُمْ وَأُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ، بِغَيْرِ حِسَـاب واما البكاؤون من خنيفتي فَأُولَئِك لَهُم الرقيع الاعلى لايشاركون فِيهِ.

١٤ - ابن عباس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاســتی الله بە ســەد و چل هەزار وشە گفتوگۆی لەگەڵ موسی ــدا كرد لــە ســێ دانە ڕۆژدا، هەمووی ئامۆژگاری بوو، ئینجا كاتێك موســی گوێی لە قســەی

مرۆڤەکان بوو ڕقی لێیان بووەوە، کاتێك کەوتە گوێیەوە لەقسەی رب العالمین، وە لەکاتی گفتوگۆکەیدا بوو کە پێی فەرموو: ئەی موسی کار کەران کاریان نەکردووە بۆ من بە وێنەی زوهد لە دونیا، وە نزیکبوان نزیك نەبونەتەوە لە من بە وێنەی وەرع لەوانەی کە حەرامم کردووە لەسەریان، وە عیبادەت کەران نەیان پەرستووم بە وێنەی گریان لە ترسی من.

موسی ووتی: ئەی پەرستراوی هەموو زەوی، ویا مالك یوم الدین، ویا ذا الجلال والإکرام، چیت بۆ ئامادە کردوون؟ وە چیان پاداشت دەدەیتەوە؟

فەرمووی: سەبارەت بە زاهیدەکان لە دونیادا، ڕێگەیان پێدەدەم لە بەهەشتەکەی مندا تێیدا بژین لە هەر شوێنێك دەیانەوێت، وە سەبارەت بە وارعەکان لەوەی کە حەرامم کردووە لەسەریان، کاتێك ڕۆژی قیامەتە هیچ بەندەیەك نامێنێتەوە ئیلا موناقەشی حسابی لەگەڵ دەکەم، وە دەگەڕێم بۆ ئەوەی کە لەدەستیدایە ئیلا وارعەکان نەبێت، من ڕێزیان لێدەنێم و بەشەرەفیان دەکەم و بەبێ حساب دەیان خەمە بەهەشتەوە، وە سەبارەت بە بەوانەی گریاون لە ترسی من ئەوانە بەرزترین بەرزی بەهەشتیان بۆ هەیە شەریکایەتیان تێدا نیە.

١٥ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّد بْنُ عَوْنٍ قَالَ: ثَنَا خَلَفُ بْنُ خَلِيفَةَ، عَنْ وَائِلِ، بْنِ دَاوُدَ فِي قَوْلِ اللّهِّ عَزَّ وَجل: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تكليما﴾ قَالَ: مرَارًا.

١٥ - وائل بن داود سـەبارەت بەفەرمايشـتى الله عز وجل: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تكليما﴾، دەڵێت: چەندين جار.

١٦ - ثنَا احمد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ الصَّاغَانِيُّ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ قَالَ: ثَنَا أَبُو تُمَيْلَةَ قَالَ: سَأَلْتُ نُوحَ بْنَ أَبِي مَرْيَمَ أَبَا عِصْمَةَ، كَيْفَ كَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى؟ قَالَ: مشافهة.

١٦ - أبو تميلة دەڵێت: پرسيارم لە نوح بن أبي مريم أبا عصمة كرد، چۆن الله قسەى لەگەڵ موسى كرد؟
ووتى: بەدەم.

١٧ - ثنَا احمد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي نَصْرُ بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: ثَنَا اشعث بن عبد الله بن اللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ ابي خَالِد الشَّعْبِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْحَارِثِ، عَنْ كَعْبٍ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَسَّمَ رُؤْيَتَهُ وَكَلامَهُ بَيْنَ مُحَمَّدٍ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلامُ كَلَّمَهُ مُوسَى مَرَّتَيْنِ وَرَآهُ مُحَمَّد مرَّتَيْنِ.

١٧ - كعب دەڵێت: اللّه عز وجل بينين و قسە كردنى دابەش كردووە لەنێوان محمد و موسى عليهما السلام موسى دووجار قسەى لەگەڵدا كردووە، وە محمد ﷺ دووجار بينيويەتى.

١٨ - ثنَا احمد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى الْعَنْبَرِيُّ قَالَ: ثَنَا أَحْمَدُ بْنُ الْمِقْدَامِ أَبُو الأَشْعَثِ قَالَ: ثَنَا هَارُونُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمُبَارك، عَن يحي بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

١٩ - وثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا ابو الْمثنى الْعَنْبَري قَالَ: أَبُو مَالِكٍ كَثِيرُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: ثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ سُلَيْمَان.

٢٠ - وثنا احْمَد قَالَ: أَبُو الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: ثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى) فَقَالَ مُوسَى لآدَمَ: يَا آدَمُ أَنْتَ الَّذِي خَلَقَكَ اللّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، أَغْوَيْتَ النَّاسَ حَتَّى أُخْرِجْتَ مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ لَهُ دم: يَا مُوسَى انت الدى اصْطَفَاكَ اللّهُ بِرِسَالَتِهِ، تَلُومُنِي أَنْ أَعْمَلَ عَمَلا قَدْ كَتَبَهُ اللّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى).

٢٠ - أبا هريرة دەڵێت: رسول اللّهّ ﷺ فەرمووی: آدم و موسى عليهما السلام بەڵگەكارییان بەسەر یەكەوە كرد، موسى به آدم ى ووت: ئەی آدم تۆ ئەوكەسەی الله بەدەستی خۆی دروستی كردووی، وە رۆحی بەبەردا كردی، خەڵكیت بێ ئومێد كرد هەتا وەكو دەرچویت لەبەهەشت،

آدم پێی ووت: ئەی موسى تۆ ئەوكەسەی الله عزوجل هەڵیبژاردووی بە ریسالەكەی، ئایا لۆمەم[1] دەكەیت لەسەر كارێك كە الله لەسەرمی

١ - بن قتيبة دەڵێت: موعتەزيلە وتيان: ئەمە دەلالەت لەوە دەكات كە موسا قەدەری بووە.

وتمان: ئێمە دەزانین هەموو شتێك بە قەزا و قەدەری الله ـیە، جگە لەوەی كە كردارەكان دەگەڕێنینەوە بۆ بكەرەكانیان، ئەوجا سوپاسی چاكەكار دەكەین لەسەر =

نووسيووه پێش دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی؟

رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەكەی زاڵبوو بەسەر موسى ـدا.

٢١ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا سُـــوَيْدُ بْنُ سَـــعِيدٍ قَالَ: ثَنَا أَيُّوبُ بْنُ النَّجَّارِ قَالَ: ذُكِرَ الْقَدَرِيَّةُ عِنْدَ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: لَا تَذْكُرْهُمْ فَإِنَّ الْمَجُوسَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُمْ، ثُمَّ قَالَ: ثَنَا أَبُو سَـــلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ.

٢١ - أيوب بن النجار دەڵێت: باســـی قەدەرییەكان كرا لای يحيى بن أبي كثير، ووتی: باســییان مەكەن چونكە مەجوســییەكان خۆشــەويســت ترن بەلامەوە وەک لەوانە، پاشان ووتی: أبو سلمة بۆی گێڕاينەوە لە أبي هريرة كە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی.

---

= چاكەكەی، وە لۆمەی خراپەكار دەكەين لەسەر خراپەكەی. «الرد على المبتدعة ١٢٠»

چەند فائيدەيەک: ئەويش ئاگاداربين وەک فيرقە گومڕاكان نەڕوانينە ئەم فەرموودەيە، وە هيچ تـاوانبـارێـک نـابێ لەســـەر تـاوانەكەی عەيبـدار بكرێـت لەكـاتێكـدا تەوبەی لەتـاوانەكە كردبێ بەتـايبەتيش آدم كە هەم تەوبەی لێ كردووە و هەميش الله لێيخۆشـــبووە، وە لەوكاتەشـــدا ناڵێت خۆت لەســـەرت نوســـيوم يا الله بەڵكو داوای لێخۆشبوون دەكات ئەم وتەيەش دوای هەزاران ساڵ دەڵێت، وە بەڵگەكەی آدم لەويا لەشوێنی خۆيەتی هەر بۆيە پێغەمبەريش ﷺ دەفەرموێت بەڵگەكەی زاڵبوو بـەســـەر موســـى ـــدا، وە ئـەـثـەرەكـەی كتێبی الـرد على المبتدعة ـش زيـاتـر بـابـەتـەكـە ڕوندەكاتەوە.

٢٢ - وثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا ابْنُ أَبِي شَـيْبَةَ قَالَ: ثَنَا ابْنُ دَاوُدَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَـالِحٍ، عَنْ أَبِي سَـعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَـى، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَـى، قَالَ ابْن ابي سَـمِينَة: قَالَ لِيَ ابْنُ دَاوُدَ: مُتِّعْتُ بك لاينبغي أَنْ يَكُونَ هَذَا مِنْ كَلامِ ابي سعيد.

٢٢ - أبي سـعيد الخدري دەڵێت: بەڵگەیان بۆ یەکتر ئەهێنایەوە آدم و موسى، آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسى،

ابن أبي سـمينة ووتی: ابن داود پێی ووتم: سـوودم لێت وەرگرت ناگونجێ ئەوە لە وتەی أبي سعيد بێت.

٢٣ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا مُسَـدَّدٌ قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ: ثَنَا ابْنُ عون.

٢٤ - وثنا احْمَد قَالَ: وَثنا مُعَاذٌ قَالَ: ثَنَا أَبِي يَعْنِي ابْن معَاذ، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، بِنَحْوٍ مِنْ حَدِيث ابي هُرَيْرَة.

٢٥ - ثنَا احْمَد قَالَ: قرىء عَلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَأَنَا أَسْـمَعُ قَالَ: ثَنَا أَشْهَلُ بْنُ حَاتِمٍ قَالَ: ثَنَا ابْنُ عَوْنٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ عَن ابي هُرَيْرَة.

٢٦ - وثنا احْمَد قَالَ: قرىء عَلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَأَنَا أَسْـمَعُ قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ: ثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ.

٢٧ - وَثنا احْمَد قَالَ: وَثنا الْحَارِثُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ هَاشِمٍ قَالَ: ثَنَا الاعمش، عَن اب صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (احْتج آدم ومُوسَى)، أَنْتَ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، واسجد لَك مَلَائِكَة، أَشْقَيْتَ النَّاسَ وَأَخْرَجْتَهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ، قَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ، وَكَلَّمَكَ تَكْلِيمًا، أَتَلُومُنِي عَلَى عَمَلٍ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى مَرَّتَيْنِ).

٢٧ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: آدم و موسى بەڵگەكارییان بەسەر یەكەوە كرد، [موسى ووتی: ] تۆ ئەوكەسەی الله بەدەستی خۆی دروستی كردویت، وە مەلائیكەتەكان سوجدەیان بۆبردیت، خەڵكت بەدبەخت كردو و بەدەركردنت دان لەبەهەشت، آدم ووتی: موسى تۆ ئەو كەسەی الله هەڵیبژاردی بەناردنی ریسالەكەی، وە بەقسەكردن قسەی لەگەڵ كردیت، لۆمەم دەكەیت لەسەر كردەوەیەك الله لەسەری نوسیوم، پێش دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەكەی زاڵبوو بەسەر موسى دا، آدم بەڵگەكەی زاڵبوو بەسەر موسى دا، دووجار.

٢٨ - ثنَا احْمَد قَالَ: قرىء عَلَى الْحَسَنِ بْنِ مُكْرَمٍ وَأَنَا أَسْمَعُ قَالَ: ثَنَا أَبُو الْمُنْذِرِ إِسْمَاعِيلُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: ثَنَا قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ عَنِ الْحَسَنِ فِي قَوْلِهِ ﴿تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ [طه ٢٢] قَالَ: سَمِعْتُ الْحَسَنَ يَقُولُ: أَخْرَجَهَا وَاللَّهِ كَأَنَّهَا مِصْبَاحٌ مِنْ غَيْرِ بَرَصٍ، فَعَلِمَ وَاللَّهِ مُوسَى أَنَّهُ قد القى ربه.

٢٨ - لــه قرة بن خــالد لــه حسن ــەوه دەربــارەی ووتەی الله: ﴿تَخْرُجْ بَيْضَــاءَ مِنْ غَيْرِ سُــوءٍ﴾ [طه ٢٢] دەڵێت: گوێم له الحســـن بوو دەيوت: كه دەری هێنا والله وەک درەوشـــاوييەک بوو كه گەڕ دەرنەدەكەوت، جا والله موسى زانی كه ئەو گەشتووه به پەروەردگاری.

٢٩ - ثَنَا احْمَد بن ســلمَان قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي شَــيْبَةَ قَالَ: ثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَمْرٍو الأَشْـعَثِيُّ قَالَ: ثَنَا سُـفْيَان بن عَيْنَيْهِ، عَنْ مُجَالِدٍ، عَنِ الشَّـعْبِيِّ، عَنْ عَامِرِ بْنِ شَـهْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَلِمَةً، وَمِنَ النَّجَاشِـيِّ كلمة، كنت عِنْد النَّجَاشِـيّ فقرء آيَةً مِنَ الإِنْجِيلِ فَضَـحِكْتُ، فَقَالَ: لي مَا ضـحكك فو اللّه لَقَدْ نَزَلَتْ مِنْ عِنْدِ ذِي الْعَرْشِ عَلَى لِسَانِ عِيسَى بْنِ مَرْيَم.

٢٩ - عامر بن شـهر دەڵێت: وشەيەكم له پێغەمبەر ﷺ بيست، وە له النجاشي ــش وشــەيــەک، لــەلای النجاشي بــووم ئايەتێكی لــه ئينجيل خوێندەوە، پێكەنيم،

پێی ووتم: بۆ پێ ئەكەنی والله لەلای خاوەن عەرشەوە دابەزيوە لەسەر زمانی عيسى بن مريم.

٣٠ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا عَمْرو بن مُحَمَّد النَّاقِد وَكَانَ صَاحِبَ حَدِيثٍ قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ احْمَد بن صَالح قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ هِشَــامِ بْنِ سَــعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْــلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَــى) فَقَالَ مُوسَــى: أَنْتَ آدَمُ

أَسْكَنَكَ اللّهَّ جَنَّتَهُ أَخْرَجْتَنَا وَنَفْسَكَ مِنَ الْجَنَّةِ. فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللّهَّ بِكَلامِهِ تَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدْ قَدَّرَهُ اللّهَّ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ، (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى).

٣٠ - عمر بن خطاب دەڵێت: رسـول اللّهّ ﷺ فەرموویەتی: آدم و موسی بەڵگەیان بۆ یەکتر ئەهێنایەوە، موسی ووتی: تۆ آدم ی الله نیشتەجێی کردیت لە بەهەشت، خۆشت وئێمەشت دەرت کرد لە بەهەشت.

آدم ووتی: ئەی موسی تۆ ئەوکەسەی الله هەڵبژاردووی بە قسەکردنەکەی، لۆمەم دەکەیت لەسەر کارێك کە الله بەقەدەر لەسەرمی نووسیوە پێش ئەوەی دروستم بکات.

[پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ] آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسی دا.

٣١ - ثنا احمد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا أَحْمَدُ بْنُ جَمِيلٍ الْمَرْوَزِيُّ قَالَ: عَبْدُ اللّهَّ بْنُ مُبَارَكٍ قَالَ: ثَنَا رَبَاحُ بْنُ زَيْد، عَنْ عَمْرو، بْنِ دِينَارٍ، عَنْ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: (إِنَّ مُوسَى حَجَّ آدَمَ) فَقَالَ مُوسَى لآدَمَ: أَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ آدَمُ: أُوتِيتَ التَّوْرَاةَ فَوَجَدْتَ فِيهَا أَنَّ ذَاكَ قَدْ قُدِّرَ عَلَيَّ قبل ان اخلق.

٣١ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی موسی بەڵگەی بۆ آدم هێنایەوە، موسی بە آدم ی ووت: دەرت کردین لەبەهەشت، آدم ووتی: تەوراتت بۆ هاتووە دۆزیتەوە تێیدا کەبەو شێوەیە ئەو قەدەرەم بەسەر دێ پێش ئەوەی دروستم بکات.

٣٢ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَوَّارٍ الْعَنْبَرِيُّ قَالَ: أنبا حَمَّادٌ يَعْنِي ابْن سَلمَة.

٣٣ - وثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذٌ قَالَ: ثَنَا مُعْتَمِرٌ جَمِيعًا، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَن ابي سَلمَة، ابْن عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ الرَّسُولَ ﷺ قَالَ: (لَقِيَ آدَمُ مُوسَى)، فَقَالَ: أَنْتَ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، ثُمَّ فَعَلْتَ مَا فَعَلْتَ، فَأَخْرَجْتَ ذُرِّيَّتَكَ مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ آدَمُ لمُوسَى: انت الذى اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ، وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا، وَآتَاكَ التَّوْرَاةَ، فَبِكَمْ تَجِدُهُ كُتِبَ عَلَيَّ عَمَلِي الَّذِي عَمِلْتُهُ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ: فَلِمَ تَلُومُنِي يَا مُوسَى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى فَحَجَّ آدم مُوسَى).

٣٣ - أبي هريرة دەفەرموێت: رسول الله فەرموویەتی ﷺ: آدم و موسى گەیشتن بەیەک [موسى] پێی ووت: تۆ ئەو کەسەی الله بەدەستی خۆی دروستی کردی، وە ڕۆحی بەبەردا کردی، پاشان ئەوەت ئەنجامدا کە ئەنجامتدا، نەوەکانت لەبەهەشت دەرکرد، آدم بە موسى ووت: تۆ ئەوکەسەی الله هەڵیبژاردی بە ریسالەکەی، وە نزیکی کردیتەوە بۆ قسەکردنی نهێنی، وە تەوراتت بۆهات، دۆزیتەوە بەچەنێک لەسەرم نوسرابوو ئەوکارەی کردم پێش ئەوەی دروست بکرێم؟
موسى ووتی: بە چل ساڵ، آدم ووتی: ئەی بۆچی لۆمەم ئەکەیت ئەی موسى.

رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بـەسـەر موسى ـدا، آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسى ـدا، آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسى ـدا.

٣٤ - ثنا احمد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَـــوَّارٍ الْعَنْبَرِيُّ قَالَ: انبأحماد بن سـلمه قَالَ: انبأحميد، عَنِ الْحَسَـنِ، عَنْ جُنْدُبٍ أَوْ غَيْرِهِ، أَنّ رَسُـولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (لَقِيَ آدَمُ مُوسَــى)، فَقَالَ لَهُ مُوسَــى: أَنْتَ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، واسـكننك جَنَّتَهُ، وَأَسْـجَدَ لَكَ مَلائِكَتَهُ، ثُمَّ فَعَلْتَ مَا فَعَلْتَ، وَأَخْرَجْتَ ذُرِّيَّتَكَ مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ آدَمُ لِمُوسَــى: أَنْتَ الَّذِي اصْـطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَـالَتِهِ وَبِكَلامِهِ، وَأَتَاكَ التَّوْرَاةَ، فَأَنَا أَقْدَمُ أَمِ الذِّكْرُ، فَقَالَ مُوسَــى: الذِّكْرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ثَلَاثَ مَرَّات).

٣٤ - الحسن دەڵێت: لـە جندب ـەوە یان جگە لـەو، کـە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: آدم و موســى بەیەک گەیشــتن، موســى پێی ووت: تۆ ئەو کەسـەی کە اللّه بەدەسـتی خۆی دروسـتی کردووی، وە لەبەهەشـتەکەی نیشتەجێی کـردی، وە مەلائیکەتەکانی هێنایە سـەجـدە[ـی ڕێـز] بـۆت، وە ئـەووت ئەنجامدا کە ئەنجامتدا، وە نەوەکانت لە بەهەشت کردنە دەرەوە، آدم بە موســى ووت: تۆ ئەو کەسـەی اللّه هەڵیبژاردی بە ریسـالەکەی و بە قسـەکردنەکەی، وە تەوراتـی بۆ ناردی، ئایا من بەپێش کەوتووم یان تەورات [مەبەسـتی ئەوەیە بە چل سـاڵ پێش ئەوەی من دروسـت بکات

تەوڕاتی نوسـیوە و تێیدا باسـی دەرکردنم کراوە، هەروەکو لە ئەثەری ٣٣ و ٤٩ ـش دا هاتووە]؟

جا موسى ووتی: تەوڕات.

جا رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بـەسـەر موسـى ـدا، آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسى ـدا، سێجار.

٣٥ - **ثَنَا** احْمَد قَالَ: ثَنَا معاوذ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ سَـوَّارٍ قَالَ: ثَنَا حَمَّادٌ قَالَ: أنا أَبُو هَارُونَ العبدى.

٣٦ - **وثنا** احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: وَثنا سَـوَّارُ بْنُ عَبْدِ اللّهِّ قَالَ: ثَنَا الْمُعْتَمِرُ قَالَ: ثَنَا أَبُو هَارُونَ، عَنْ أَبِي سَـعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنّ رَسُـولَ اللّهِّ ﷺ قَالَ: قَالَ آدَمُ: أَرَأَيْتَ مَا قَدْ عَلِمَ أَنَّهُ سَـيَكُونُ بُدٌّ مِنْ أَنْ يَكُونَ، قَالَ: لَا. قَالَ رَسُولُ اللّهِّ ﷺ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ثَلاثَ مَرَّات).

٣٦ - أبي سعيد الخدري دەڵێت: رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم ووتی: وای ئەبینیت کە ئەمزانی ئەو شتەی ڕوویدا ڕوو ئەدات؟ [موسى] ووتی: نەخێر.

رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسى ـدا، سێجار.

٣٧ - **ثَنَا** احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: عَبْدُ اللّهِّ بْنُ سَـوَّارٍ قَالَ: ثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَـلَمَةَ، عَنْ عمار، بن أبي عماد، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنّ رَسُـولَ اللّهِّ ﷺ قَالَ:

(لَقِيَ آدَمُ مُوسَـــى)، فَقَالَ مُوسَـــى: يَا آدَمُ أَنْـتَ الَّـذِي خَلَقَـكَ اللَّهُ بِيَـدِهِ، وَأَسْـكَنَكَ جَنَّتَهُ، وَأَسْـجَدَ لَكَ مَلائِكَتَهُ، ثُمَّ فَعَلْتَ مَا فَعَلْتَ، فَأَخْرَجْتَ ذُرِّيَّتَكَ مِنَ الْجَنَّةِ، وَقَالَ آدَمُ: يَا مُوسَى أَنْتَ الَّذِي اصْـطَفَاكَ اللَّهُ لِرِسَـالَتِهِ وَكَلَّمَكَ، وَأَتَاكَ التَّوْرَاةَ، فَأَنَا أَقْدَمُ أَمِ الذِّكْرُ، قَالَ مُوسَـى: بَلِ الذِّكْرُ، قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ثَلَاثًا).

٣٧ - أبي هريرة دەڵێت: رسـول الله ﷺ فەرموویەتی: آدم و موسـی بەیەک گەیشتن، موسی ووتی: ئەی آدم تۆ ئەوکەسەی الله بەدەستی خۆی دروســـتی کردی، وە نیشـــتەجێی کردیت لە بەهەشـــتەکەی، وە مەلائیکەتەکانی هێنایە ســـوجدە بۆت، پاشـــان ئەووت ئەنجامدا کە ئەنجامتدا، نەوەکانت دەرکرد لە بەهەشت، وە آدم وتی: ئەی موسی تۆ ئەو کەسەی الله هەڵیبژاردی بە ریسالەکەی و قسەی لەگەڵ کردیت، وە تەوراتی بۆناردیت، ئایا من بەپێش کەوتووم یان تەورات؟

موسی ووتی: بەڵکو تەورات.

رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسی ـدا، سێجار.

٣٨ - ثنا احمد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا سَـــوَّارٌ قَالَ: ثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ: ثَنَا صَالح يعن بن أَبِي الأَخْضَرِ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (تَحَاجَّ آدَمُ وَمُوسَـــى)، فَقَالَ مُوسَـــى: انت اااادم الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَأَسْـــكَنَكَ جَنَّتَهُ، فَأَخْرَجْتَ ذُرِّيَّتَكَ مِنْهَا، فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَـى الَّذِي اصْـطَفَاكَ اللَّه لرسالته وَكَلَامه، تحاجني على امْر قد قدر من قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ، قَالَ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ: (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى).

٣٨ - أبي هريرة دەڵێـت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: آدم و موســى بەڵگەيان بۆيەكتر هێنايەوە، موســى ووتى: آدم تۆ ئەوكەســەى الله بەدەستى خۆى دروستى كردى، وە نيشتەجێى كردى لە بەهەشتەكەى، نەوەكـانـت دەركرد تيـايـدا، آدم ووتى: موســى تۆ ئەوكەســەى الله هەڵيبژاردى بۆ ريســـالەكەى و قســەكردنەكەى، بەڵگە بە كـارێـك ئەهێنيتەوە كە الله بەقەدەر لەســەرى نوسـيوم پێش ئەوەى دروسـتم بكات.

ووتى: پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: آدم بەڵگەكەى زاڵبوو بەسەر موسى ـدا.

٣٩ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا إِسْـمَاعِيلُ بْنُ إِسْـحَاقَ قَالَ: ثَنَا القعني، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: (تَحَاجَّ آدَمُ وَمُوسَى، فحج آدم مُوسَـى)، فَقَالَ لمُوسَــى: أَنْتَ الَّذِي أَغْوَيْتَ النَّاسَ وَأَخْرَجْتَهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ آدَمُ: وَأَنْتَ مُوسَى الَّذِي أَعْطَاكَ اللَّهُّ عِلْمَ كُلِّ شَيْءٍ، وَاصْطَفَاكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَـــالَتِهِ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ عَلَيَّ قبل ان اخلق.

٣٩ - أبي هريرة دەڵێـت: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: بەڵگەيـان بۆ يەک ئەهێنايەوە آدم و موسى، آدم بەڵگەكەى زاڵبوو بەسەر موسى ـدا، موسى ووتى: تۆ ئەو كەسەى خەڵكيت بێ ئوميێد كرد، وە دەرت كردن لە بەهەشت، آدم ووتى: موسى تۆ ئەوكەسەى الله عيلمى هەموو شتێكى پێ بەخشيت، وە هەڵيبژاردى لەسەر خەڵک بە ريسالەكەى، موسى ووتى:

بەڵێ، آدم ووتی: لۆمەم ئەکەیت لەســەر کارێک بەقەدەر لەســەرم نوسرابوو پێش ئەوەی دروستم بکات.

٤٠ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا إِسْــمَاعِيلُ بْنُ إِسْــحَاقَ قَالَ: ثَنَا حَجَّاجُ بْنُ الْمِنْهَالِ، وَعَارِمُ بْنُ الْفَضْـلِ قَالا: ثَنَا إِسْـمَاعِيلُ بْنُ مَهْدِيٍّ بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِـيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (الْتَقَى آدَمُ وَمُوسَى) فَقَالَ مُوسَى لآدَمَ: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي أَشْــقَيْتَ النَّاسَ، وَأَخْرَجْتَهُمْ مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ آدَمُ لِمُوسَــى: أَنْتَ مُوسَـى الَّذِي اصْـطَفَاكَ اللّهُ برسـالته واصـطفاك لِنَفْسِـهِ، وَأَنْزَلَ عَلَيْكَ التَّوْرَاةَ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَهَلْ وَجَدْتَهُ كُتِبَ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى.

٤٠ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: آدم و موســی بەیەک گەیشتن، موسی بـە آدم ـی ووت: آدم تـۆ ئـەو کەسەی خەڵکت بەدبەخت کـرد، وە دەرت کـردن لـە بەهەشت، آدم بە موســی ـی ووت: موســی تـۆ ئەو کەســەی الله هەڵـبـژاردوی بە ریســـاڵەکەی وە هەڵیبژاردووی بۆ نەفسی خۆی، وە تەوراتی بۆ دابەزاندی، موسی ووتی: بەڵێ، آدم ووتی: ئایا دۆزیتەوە [لە تەوراتدا] لەســەرم نوســرابوو پێش ئەوەی دروستم بکات؟ موسی ووتی: بەڵێ.

رسول الله ﷺ فەرمووی: آدم بەڵگەکەی زاڵبوو بەسەر موسی ـدا.

٤١ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا إِسْــمَاعِيلُ بْنُ إِسْــحَاقَ، وَمُعَاذُ بن الْمثنى قَالَا: ثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ: ثَنَا ابْنُ عون.

٤٢ - وثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا مُسَـــدَّدٌ ثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْع ثَنَا ابْن عون.

٤٣ - أنبأ احْمَد قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: ثَنَا أَبِي، عَنِ ابْنِ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اخْتَصَمَ آدَمُ وَمُوسَى فَذَكَرَ مثله.

٤٣ - أبي هريرة دەڵێت: آدم و موســـى گفتوگۆيـان دەكرد، ئينجـا بەهەمان شێوە باسيكرد.

٤٤ - ثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ الْحِزَامِيُّ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: ثَنَا هِشَــامُ بْنُ سَــعْدٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْــلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: نَحْوَهُ فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى.

٤٥ - ثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُــلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا جُبَارَةُ قَالَ: ثَنَا قَيْسٌ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَــالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ.

٤٦ - ثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سُلَيْمَان قَالَ: ثَنَا ابو عمَارَة قَالَ: ثَنَا الْفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ قَالَ: (كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ).

٤٦ - أبي سعيد دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەهەمان شێوەی ڕیوایەتەکانی تر، آدم ووتی: الله لەسەری نوسیوم پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات.

٤٧ - قَالَ مُحَمَّد بن عُثْمَان الْمَكِّيّ قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة، عَن النبي ﷺ: إلا أَنَّهُ قَالَ لِمُوسَى تَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِّرَ قَبْلَ أَنْ أخلق.

٤٧ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وەک ڕیوایەتەکانی تر جگە لەوەی کە بە موسی ـی فەرمووە: لۆمەم دەکەیت لەسەر کارێك کە نوسراوە لەسەرم پێش ئەوەی دروستم بکات.

٤٨ - ثَنَا احْمَد، نَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِّ قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِّ بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: ثَنَا عِكْرِمَةُ، بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِّ ﷺ: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى).

٤٨ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: آدم و موسى و بەڵگەیان بۆیەکتر هێنایەوە آدم بەسەریا زاڵبوو.

٤٩ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ حَنْبَلٍ الشَّـيْبَانِيُّ، ثَنَا أَبِي، ثَنَا سُـفْيَان، عَن عَمْرو سـمع طاووسـا سَـمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُـولُ اللّهِ ﷺ: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى)، فَقَالَ مُوسَى: يَا آدَمُ أَنْتَ أَبُونَا خَيَّبْتَنَا، وَأَخْرَجْتَنَا مِنَ الْجَنَّةِ، فَقَالَ لَهُ آدَمُ: يَا مُوسَـى أَنْتَ الَّذِي اصْـطَفَاكَ اللّهُ بِكَلامِهِ، وَقَالَ - مَرَّةً بِرِسَـالَتِهِ وَخَطَّ لَكَ بِيَدِهِ، أَتَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدَّرَهُ اللّهُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً. (فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ثَلاثًا).

٤٩ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: آدم و موسـی بەڵگەیان بۆیەکتر هێنایەوە، موسـی ووتی: آدم تۆ باوکمانی نائومێدت کردین، وە دەرت کردین لەبـەهـەشـت، آدم ـیش پێی ووت: ئـەی موسی تۆ ئەو کەسـەی الله هەڵیبژاردی بە قسـەکردنەکەی - جارێکی تر ووتی بە ریسالەکەی بەدەستی خۆی بۆی نوسیت، ئایا لۆمەم دەکەیت لەسەر کارێک کە الله بەقەدەر نوسیوییەتی لەسـەرم بە چل ساڵ پێش ئەوەی دروستم بکات.

[پێغەمبەر ﷺ فەرمـووی: ] آدم بەڵگەکەی زاڵ بـوو بەسەر موسـی ـدا سێ جار.

٥٠ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: ثَنَا مَعْمَر، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ.

٥١ - وثنا عَبْدُ اللّهِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: وثنا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: ثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٢ - وثنا احْمَد قَالَ: وثنا عَبْدُ اللّهِ قَالَ: وَحَدَّثَنِي أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ ابْن سعيد قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ شِهَابٍ، عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ.

٥٣ - وثنا أَحْمد قَالَ: وثنا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّد ابْن بِشْرٍ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٥٤ - ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا أَيُّوبُ بْنُ النَّجَّارِ الْيَمَامِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: (احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى)، فَقَالَ مُوسَى لآدَمَ: يَا آدَمُ أَنْتَ الَّذِي أَدْخَلْتَ ذُرِّيَّتَكَ النَّارَ، فَقَالَ آدَمُ: يَا مُوسَى أَنْتَ الَّذِي اصْطَفَاكَ اللّهُ بِرِسَالَتِهِ وَكَلامِهِ، وَأَنْزَلَ عَلَيْكَ التَّوْرَاةَ فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا أَنِّي أَهْبِطُ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (فَحَجَّهُ آدَمُ) وَالْحَدِيثُ عَلَى لَفْظِ حَدِيثِ مَعْمَرٍ عَن الزُّهْرِيّ عَن ابي جعدة عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَالْمعْنَى وَاحِد.

٥٤ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: آدم و موسی بەڵگەیان بۆ یەکتر هێنایەوە، موسی بە آدم ی ووت: ئەی آدم تۆ ئەوکەسەی نەوەکانت کردە ئاگرەوە، آدم ووتی: ئەی موسی تۆ

ئەوکەسەی الله هەڵیبژاردی بە ریسالەکەی و قسەکردنەکەی، وە تەوراتی بۆ دابەزاندی ئایا تیایدا دۆزیتەوە من دا ئەبەزم [لەبەهەشت]، موسی ووتی: بەڵێ.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: آدم بەبەڵگە بەسەریدا زاڵ بوو.

وە فەرموودەکە لەسەر لەفزی فەرموودەکەی معمر ـە لـە الزهري لە ابي جعدة لە پێغەمبەرەوە ﷺ واتاکەیان یەکێکە.

٥٥ - ثنا احمد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الْمُتَعَالِ شَيْخُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا ضَمرَة بن شَوْذَبٍ قَالَ: أَوْحَى اللَّهُ إِلَى مُوسَى، يَا مُوسَى هَلْ تَدْرِي لِمَ اصْطَفَيْتُكَ لِكَلامِي وَلِرِسَالَتِي، قَالَ: لَا يَا رَبِّ، قَالَ: لأَنَّهُ لَمْ يَتَوَاضَعْ لِي أَحَدٌ تَوَاضُعَكَ.

٥٥ - ضمرة بن شوذب دەڵێت: الله وەحی بۆ موسی کرد: ئەی موسی، ئایا دەزانی بۆچی تۆم هەڵبژاردوە بە قسەکردنەکەم وریسالەکەم؟
ووتی: نەخێر ئەی پەروەردگار،
فەرمووی: لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك خۆی بەکەم نەزانیوە بەرامبەر بە من وەك خۆبەکەم زانینەکەی تۆ.

٥٦ - ثنا احمد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى أَبِي قَالَ: ثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُوسَى قَالَ: ثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ أَنَّ رَجُلا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلا فَذَهَبَ بِي إِلَى دَار اذا فِي

وَسَطِهَا مِنْبَرٌ مِنْ ذَهَبٍ واذا انت فَوْقه واذا انا عَن يَمِينك رجل نَصَتَ النَّاسُ إِلَى كَلامِهِ، قَالَ: (أَمَّا الَّذِي رَأَيْتَهُ عَنْ يَمِينِي فَمُوسَـــى إِذَاتَكَلَّمَ نُصِـــتَ لَهُ لِفَضْلِ كَلامِ اللّه عز وَجل).

٥٦ - ثـابـت البنـاني دەڵێـت: كه پیـاوێـك هـات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: من ئەوەم بینی كه خەوتوو دەیبینێت، -جا باســی فەرموودەكەی كرد بە درێژی- ووتی: منیـان برد بۆ جێگەیەك كە لە نـاوەڕاســـتەكەیدا مینبەرێك هەبوو لە ئاڵتون وە تۆ لەسەر ئەو مینبەرە بوویت، وە پیاوێك لای ڕاســـتەوە بوو، كـاتێـك قســـەی بكردایە خەڵكی گوێیان دەگرت بۆ قسەكەی،

فەرمووی: ئەوەی كە لای ڕاستی من بینیوتە، ئەوە موسى ـیە كاتێك كە قسە دەكات خەڵكی گوێی بۆ دەگرن لەبەر فەزڵی كەلامی اللّه عزوجل.

٥٧ - ثنَا احْمَد بن سلمَان قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ زِيَادٍ سَبَلانُ قَالَ: ثَنَا عَبَّادُ بْنُ عَبَّادٍ قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ بْنُ حَازِمٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: الْخُلَّةُ لإِبْرَاهِيمَ، وَالْكَلامُ لِمُوسَـــى، وَالرُّؤْيَةُ لِمُحَمَّدٍ ﷺ.

٥٧ - ابن عباس دەڵێت: خۆشـــەویســـتـی بۆ إبراهيم، وە قســـە بۆ موسى، وە بینین بۆ محمد ﷺ.

٥٨ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكَّارٍ وَمُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ الْوَرْكَانِيُّ قَالَ: أَنْبَأَ إِسْمَاعِيلُ بْنُ زَكَرِيَّا عَنْ عَاصِمٍ الأَحْوَلِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ اللّه اصْطَفَى لإِبْرَاهِيمَ الْخُلَّةَ، وَاصْطَفَى مُوسَى بِالْكَلامِ، وَاصْطَفَى مُحَمَّدًا بِالرُّؤْيَةِ.

٥٨ - ابن عباس دەڵێت: بەڕاستی الله إبراهیم ـی هەڵبژارد بە خۆشەویستی، وە موسى ـی هەڵیبژارد بە قسەکەی، وە محمد ﷺ ـی هەڵبژارد بە بینین.

٥٩ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: ثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَتَعْجَبُونَ أَنْ تَكُونَ الْخُلَّةُ لإِبْرَاهِيمَ، وَالْكَلامُ لِمُوسَى، وَالرُّؤْيَةُ لِمُحَمَّدٍ ﷺ.

٥٩ - ابن عباس دەڵێت: ئایا سەرسام دەبن بەوەی کە خۆشەویستی بۆ إبراهیم بێت، وە قسە بۆ موسى، وە بینین بۆ محمد ﷺ.

٦٠ - قَالَ ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي سُلَيْمَانَ بْنِ حَبِيبٍ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو الرَّقِّيُّ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَرْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ، عَن كَعْب قَالَ: كَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أَكُونُ عَلَى الْحَالِ الَّتِي أُجِلُّكَ أَنْ أَذْكُرَكَ، عَلَيْهَا الْخَلاءِ، وَالرَّجُلُ يُجَامِعُ؟ قَالَ: يَا مُوسَى اذْكُرْنِي على كل حَالَ.

٦٠ - كعب دەڵێت: الله قسەی لەگەڵ موسی کرد، موسی وتی: ئەی پەروەردگار من لەحاڵەتێکدا دەبم دەمەوێت تێیدا زیکری تۆ بکەم، تەوالێت، وە پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەیدا جووت دەبێت؟
فەرمووی: ئەی موسی زیکر و یادم بکە لە هەموو بارێکدا.

٦١ - حَدثنَا احمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي جَرِيرٌ عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: كَانَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام قبَّة طولهَا سِتّمائَة ذِرَاعٍ، يُنَاجِي فِيهَا رَبَّهُ جَلَّ وَعز.

٦١ - عطاء بن سائب دەڵێت: موسی علیه السلام گومەزێکی هەبوو درێژیەکەی شەش سەد باڵ بوو، گفتوگۆی دەکرد تێیدا لەگەڵ پەروەردگاری عزوجل.

٦٢ - حَدثنَا احمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: ثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: ثَنَا خَلَفُ بْنُ خَلِيفَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ الأَعْرَجِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لَمَّا كَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى، كَانَ عَلَيْهِ جُبَّةُ صُوفٍ، وَعِمَامَةُ صُوفٍ، وَنَعْلانِ مِنْ جِلْدِ حمَار غير ذكي).

٦٢ - عبد الله بن مسعود دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: کاتێك موسی قسەی لەگەڵ پەروەردگاری کرد عزوجل، جبەیەکی خوری لەبەردابوو، وە عەمامەیەکی خووری لەسەردا بوو، وە نەعلەکانی لە پێستی کەرێکی مردارەوبوو دروست کرابوون.

٦٣ - حَدثنَا احمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي هَدِيَّةُ بْنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ قَالَ: ثَنَا الْفَضْــلُ قَالَ: أَنْبَأَ الأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي إِسْــحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَبْدِ اللّهِّ بْنِ مَسْــعُودٍ قَالَ: لَمَّا انْتَهَيْتُ إِلَى مَدْيَنَ، سَــأَلْتُ عَنِ الشَّــجَرَةِ الَّتِي كَلَّمَ اللّهُّ مُوسَــى مِنْهَا، فَدُلِّلْتُ عَلَيْهَا، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهَا فَإِذَا هِيَ شَجَرَةٌ خَضْرَاءُ تَرِفُّ، فَتَنَاوَلَتْ نَاقَتِي مِنْ وَرَقِهَا فَلاكَتْهُ فَلَمْ تَسْتَطِعْ أَنْ تَبْلَعَهُ فَطَرَحَتْهُ، فَصَلَّيْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ ورجعت.

٦٣ - عبد الله بن مسـعود دەڵێت: كاتێك گەيشـتمە مدين، پرسـيارم كرد لەو دارەى كە الله قسـەى تێداكرد لەگەڵ موســى، جا نيشــانم درا، چوومە لاى دارێكى ســەوزى گەشــاوە بوو، جا وشــترەكەم لەگەڵاكانى خوارد وجوى، بەڵام نەيتوانى قوتيان بدات بۆيە فڕێيدا، جا صـەڵاواتم دا لەسەر پێغەمبەر ﷺ و گەڕامەوە.

٦٤ - ثنَا احمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ احمَد نَا عُثْمَانَ بْنِ أَبِي شَــيْبَةَ قَالَ: ثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللّهِّ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَّا خَرَجْتُ إِلَى الشَّــامِ فَمَرَرْتُ بِالشَّــجَرَةِ الَّتِي نُوحِيَ مِنْهَا مُوسَــى، فَإِذَا هِيَ شَجَرَةٌ خَضْرَاءُ تَرِفُّ.

٦٤ - عبد الله بن مسعود دەڵێت: دەرچووم بۆ شام جا ڕۆشتم بەلاى ئـەو دارەى كـە موسى ــ لێووە بـانـگ كـرابوو، ڕەنـگـەكـەى سەوزێكى گەشاوە بوو.

٦٥ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ احْمَد قَالَ: نَا مُحَمَّدُ بْنُ مَنْصُـــورٍ قَالَ: ثَنَا عَفَّانُ قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ عَبْدِ اللّهِّ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لأَبِي ذَرٍّ: لَوْ رَأَيْتَ النَّبِيَّ ﷺ لَسَـأَلْتُهُ هَلْ رَأَى رَبَّهُ؟ قَالَ: قَدْ سَـأَلْتُهُ، قَالَ: قَدْ رَأَيْتُهُ كَذَا قَالَ.

٦٥ - عبداللّه بن شقيق دەڵێت: بە أبي ذر ــم ووت: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ـم بینیبایە ئەوا پرسیارم لێدەکرد ئایا پەروەردگاری بینیووە عز وجل؟

ووتـی: پرسیارم لێکردووە،

فەرمووی: بینیومە، بەو شێوەی فەرموو.

٦٦ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ احْمَد قَالَ: عَلِيُّ بْنُ مُسْــلِمٍ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الصَّمَدِ قَالَ: ثَنَا أَبَانُ قَالَ: ثَنَا أَبُو عِمْرَانَ، عَنْ نَوْفٍ: أَنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلامُ لَمَّا نُودِيَ، قَالَ: مَنْ أَنْتَ الَّذِي تُنَادِي، قَالَ: أَنَا رَبُّكَ الاعلى.

٦٦ - نوف دەڵێت: کاتێک موسى عليه السلام بانگکرا،

ووتـی: تۆکێی بانگم ئەکەیت؟

فەرمووی: من پەروەردگاری هەرە بەرزی تۆم.

٦٧ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ الْعَبَّاسُ بن عبد الْعَظِيم بِخَط بِيَدِهِ قَالَ: ثَنَا زَيْدُ بْنُ الْمُبَارَكِ أَبُو عَبْدِ اللّهِّ الصَّـــنْعَانِيُّ وَنِعْمَ الزَّيْدُ مَا عَلِمْتُ كَانَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ مِقْسَـــمٍ، عَن عَطاء، عَنْ وَهْــبِ بْنِ مُنَبِّهٍ قَالَ: كَلَّمَ اللّهُّ مُوسَـــى فِي أَلْفِ مَنَام وَكَانَ إِذَا كَلَّمَهُ رُؤِيَ النُّورُ فِي وَجْهِهِ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَمْ يَتَعَرَّضْ لِلنِّسَاءِ مُنْذُ كَلَّمَهُ عَزَّ وَجل.

٦٧ - وهب بن منبه دەڵێت: الله عزوجل قسـەى لەگەڵ موسـى كرد له هەزار دانه خەون ـدا، وه كاتێك قسەى لەگەڵدا دەكرد بۆ ماوەى سێ ڕۆژ نور لەسەر ڕوخسارى دەبينرا، لەو كاتەوەى كه پەروەردگارى عزوجل قسەى لەگەڵ كردووه بەر ژن نەكەوتووه.

٦٨ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنَا رَجُلٌ سَمَّاهُ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءَ بْنَ مُسْلِمٍ يَقُولُ: ثَنَا وَهْبُ بْنُ مُنَبِّهٍ قَالَ: كَانَ لِمُوسَـى أُخْتٌ يُقَالُ لَهَا مَرْيَمُ فَقَالَتْ يَا مُوسَـى إِنَّكَ تَزَوَّجْتَ الى شُـعَيْب وانت يَوْمِئِذٍ لاشـىء لَكَ ثُمَّ أَدْرَكْتَ مَا أَدْرَكْتَ فَتَزَوَّجَ فِي مُلُوكِ بَنِي إِسْـرَائِيلَ قَالَ وَلِمَ أَتَزَوَّجُ فِي مُلُوكِ بَنِي إِسْـرَائِيلَ فَوَاللَّهِ مَا أَحْتَاجُ إِلَى النِّسَاءِ مُذْ كَلَّمْتُ رَبِّي عز وَجل.

٦٨ - وهب بن منبه دەڵێت: موسى خوشكێكى هەبوو پێيان دەووت: مريم، جا پێى ووت: ئەى موسـى، تۆ هاوسـەرگيرت كرد لەگەڵ ئالى شعيب ـدا صلوات الله عليه، تـۆ ئـەو ڕۆژه هيچت نـەبوو، گەيشتيت بەوەى كه پێى گەيشـتيت، جا هاوسـەرگيرى بكه لەگەڵ پاشـاكانى بەنى ئيسرائيل ـدا،

ووتى: بـۆچى هاوسەرگيرى بكەم لەگەڵ پاشەكانى بـەنى ئيسرائيل ـدا جا والله هيچ پێويسـتم به ئافرەت نەماوه لەو كاتەوەى قسـەم لەگەڵ پەروەردگارم كردووه عزوجل.

٦٩ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: ثَنَا ابو الْحسن ابْن الْعَطَّارِ قَالَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ ابراهيم الدّور قي يَقُولُ: سَمِعْتُ مَرْوَانَ بْنَ مُعَاوِيَةَ يَقُول: حَدثنِي ابْن عَمٍّ لِي مِنْ خُرَاسَانَ: أَنَّ جَهْمًا شَكَّ فِي اللّهِّ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، لَعَنَ اللّهَّ جَهْمًا.

٦٩ - مروان بن معاوية دەڵێت: بۆی باسکردم ئامۆزاکەم لە خوراسان: کە جەهم لە گوماندا بوو لە الله عزوجل چل دانە بەیانی، لەعنەتی الله لە جەهم بێت.

٧٠ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهَّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ عُمَرَ قَالَ: ثَنَا ابْنُ مَهْدِيٍّ، عَنْ قُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَسَنَ ﴿تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ [طه ٢٢] قَالَ: اخرجها وَاللّه بَيْضَاء من غير سوء فَعَلِمَ وَاللّهِّ مُوسَى أَنَّهُ لَقِيَ ربه عز وَجل.

٧٠ - لە قرة ـەوە وتی: گـوێم لە حسن بوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ [طه ٢٢]
ووتی: دەری هێنا والله بە سپێتی وبەبێ عەیب و خراپی، جا والله موسى زانی کە ئەو گەشتووە بە پەروەردگاری عزوجل.

٧١ - قَالَ حدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِّ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَحْمَدُ بْنُ شَبُّوَيْهِ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ الْحَسَنِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَمِعْتُ

عبد اللّه بن المبارك يَقُولُ: الإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ، يَزِيدُ وَيَنْقُصُ، وَسَــمِعْتُهُ يَقُولُ: إِنَّا لَنَحْكِي كَلامَ الْيَهُودِ وَالنَّصَــارَى، وَلا نَسْــتَطِيعُ أَنْ نَحْكِيَ كَلامَ الْجَهْمِيَّةِ.

٧١ - على بن الحسن بن شقيق دەڵێت: گوێم له عبداللّه بن المبارك بوو دەیوت: ئیمان: وته و کرداره، زیاد دەکات و کەم دەکات.
وه گوێم لێی بوو دەیوت: ئێمه قسەی جولەکه و گاورەکان دەگێڕینەوە، بەڵام ناتوانین که قسەی جەهمیەکان بگێڕینەوە.

٧٢ - ثنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدُوسِ بْنِ كَامِلٍ قَالَ: ثَنَا الْعَبَّاسُ بْنُ أَبِي شَــقِيقٍ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مُحَمَّدٍ بْنِ حَبِيبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي جَدِّي حَبِيبُ بْنُ أَبِي حَبِيبٍ قَالَ: سَمِعْتُ خَالِدَ بْنَ عَبْدِ اللّهِ الْقَسْرِيَّ وَقَدْ خَطَبَ النَّاسَ بِوَاسِطَ فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ خُطْبَتِهِ قَالَ: ايها النَّاس ارجعو فَضَحُّوا تَقَبَّلَ اللّهُ مِنْكُمْ إِنِّي مضح عَنْكُم بِـالْجَعْـدِ بْنِ دِرْهَمٍ، زَعَمَ أَنَّ اللّهَ لَمْ يَتَّخِـذْ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلا، وَلا كَلَّمَ مُوسَــى تَكْلِيمًا، وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُ الْجَعْدُ بْنُ دِرْهَمٍ عُلُوًّا كَبِيرًا، ثُمَّ نَزَلَ إِلَيْهِ فَذَبَحَهُ، وَقِيلَ: الْمُغِيرَةُ بْنُ سَــعِيدٍ وَكَانَ مِنْ زَنَادِقَةِ الْكُوفَةِ، كَانَ يَزْعُمُ أَنَّ عَلِيًّا يُحْيِي الْمَوْتَى.

٧٢ - حبيب بن أبي حبيب دەڵێت: بیستم له خالد بن عبد الله القسري له ڕۆژی جەژنی قوربـان وتـاری دەدا بۆ خەڵـك له واســط، کـاتێـك له وتـارەکەی تەواو بوو، وتـی: ئەی خەڵکینه، بگەڕێنەوە قوربـانـی بکەن، الله لێتان قبوڵ بکات، بەڕاسـتـی منیش جعد بن درهم دەکەمه قوربانی،

چـونـكه ئـەو پێی وایـە كـەوا الله عز وجل ابـراهـيـم ـی نـەكردۆته خۆشـەويسـتی خۆی، وه الله به قسـەكردن قسـەی نەكردووه لەگەڵ موسـی، پەروەردگار بەرز و بڵند و گەورەيه لەوەی لەوەی كه جعد بن درهم دەيڵێت، پاشـان بۆی دابەزی و سـەری بڕی، وه وترا: المغيرة بن سـعيد له زنديقەكانی كوفه بووه، بانگەشـەی ئەوەی كردووه كه علي مردوو زيندوو ئەكاتەوه.

٧٣ - قَالَ ثَنَا احْمَد قَالَ: أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ شَاهِينَ قَالَ: ثَنَا بَحْرُ بْنُ نَصْرِ بْنِ سَابِقٍ، عَنْ ضَمْرَةَ، عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ هِلالٍ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ أَوَّلَ مَنْ سَجَدَ مِنَ الْمَلائِكَةِ يَعْنِي لآدَمَ إِسْـرَافِيلُ، فَأَثَابَهُ اللّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ كَتَبَ الْقُرْآنَ فِي جَبْهَتِهِ.

٧٣ - عبدالعزيزی بن هلال دەڵێت: پێم گەيشـتوه يەكەم كەس كه سـوجدەی برد واته بۆ ئادەم له مەلائيكەتەكان ئيسـرافيل بوو، الله عز وجل پاداشتی كرد بەوەی له ناوچەوانی قورئانی نوسی.

٧٤ - ثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ الْخُزَاعِيُّ قَالَ: ثَنَا مُوسَـى بْنُ خَلَفٍ عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ سَـلامٍ، عَنْ جَدِّهِ مَمْطُورٍ، عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السَّـكْسَكِيِّ، عَنْ مَالِكِ بْنِ يُخَامِرَ أَبُو مَالِكٍ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللّهِ ﷺ: (أَتَانِي رَبِّي فِي أَحْسَـنِ صُـورَةٍ، فَوَضَـعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَجَلا لِي مَا فِي السَّـمَوَاتِ وَالأَرْضِ، فَعَرَفْتُهُ)، فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟

قُلْتُ: (لَا يَا رَبِّ)، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ هَلْ تَدْرِي فِيمَا يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (لَا يَا رَبِّ)، ثُمَّ قَالَ لِي فِي الْمَرَّةِ الثَّالِثَةِ: هَلْ تَدْرِي فِيمَا يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (نَعَمْ فِي الدَّرَجَاتِ، وَالْكَفَّارَاتِ)، قَالَ: فَمَا الدَّرَجَاتُ وَالْكَفَّارَاتُ؟ قُلْتُ: (إِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَالصَّلاةُ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ)، قَالَ: صَدَقْتَ، قَالَ: فَمَا الْكَفَّارَاتُ؟ قُلْتُ: (إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي السَّبَرَاتِ، وَالصَّلَاةُ بعد الصَّلَاة، وَنقل الاقدام الى الجماعَاتٍ)، قَالَ: صدقت.

٧٤ - معاذ بن جبل دەڵێت: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارم [لەخەومدا] هات بۆلام لە جوانترین وێنەدا، دەستی دانا لەنێوان هەردوو شانم هەتاوەکو هەستم بە ساردی کرد لە نێوان هەردوو مەمکم، جا ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی ـدا بوو بۆی ئاشکرا کردم، جا ناسیمەوە، پێی فەرمووم: ئەی محمد ﷺ ئەزانی مەلایکەتە بەرزەکانی ئاسمان دەربارەی چی مشتومڕ دەکەن؟ ووتم: نەخێر ئەی پەروەردگارم، پاشان فەرمووی: ئەی محمد ﷺ ئەزانی مەلایکەتە بەرزەکانی ئاسمان دەربارەی چی مشتومڕ دەکەن؟ ووتم: نەخێر ئەی پەروەردگار، پاشان پێی فەرمووم لە جارێ سێیەمدا: ئایا ئەزانی مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان دەربارەی چی مشتومڕ دەکەن؟ ووتم: بەڵێ دەربارەی الدرجات [ئەو کارانەی پلەی بڕوادار بەرزەکەنەوە] و الكفارات [ئەو کارانەی ئەبنە هۆی سڕینەوەی تاوان]،

فەرمووی: الكفارات و الدرجات چییە؟

ووتی: بەخشینی خواردنە، وە نوێژ کردن بە شەو لەکاتێکدا خەڵکی خەوتوون، فەرمووی: ڕاستت کرد فەرمووی: ئەی الكفارات چییە؟

ووتم: دەست نوێژ گرتن بەچاكی لەكاتی سەرمادا، وە نوێژ لە دوای نوێژ، وە هەنگاونان بۆ نوێژی جەماعەت، فەرمووی: ڕاستت كرد.

٧٥ - ثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّد بن سعيد ابْن سُوَيْدٍ قَالَ: ثَنَا أَبِي سَعِيدُ بْنُ سُوَيْدٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ وَأَجْمَلِهَا)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، قُلْتُ: (لَبَّيْكَ يَا رَبِّ)، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (لَا ادرى يَا رب، فَوَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَعَلِمْتُ مِنْ كل شىء)، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، قُلْتُ: (لَبَّيْكَ)، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (فِي الْكَفَّارَاتِ فَذَكَرَ الْحَدِيث بِطُولِهِ).

٧٥ - معاذ بن جبل دەڵێت: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارم بینی چاكترین و جوانترین وێنەدا، فەرمووی: ئەی محمد، ووتم: لە خزمەتدام ئەی پەروەردگار، فەرمووی: مەلائیكەتە بەرزەكانی ئاسمان دەربارەی چی مشتومڕ دەكەن؟ ووتم: نازانم ئەی پەروەردگار، دەستی دانا لەنێوان شانم هەستم بە ساردی كرد لەنێوان مەمكەكانم، جا هەموو شتێكم زانی، فەرمووی: ئەی محمد، ووتم: لەخزمەتدام، فەرمووی: مەلائیكەتە بەرزەكانی ئاسمان دەربارەی چی مشتومڕ دەكەن؟

ووتم: دەربارەی الكفارات، جا باسی فەرموودەكەی كرد بەدورو درێژی.

٧٦ - حَدثنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّاس الْمُؤَذّن قَالَ: ثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ الْقَوَارِيرِيُّ قَالَ: ثَنَا مُعَاذُ بْنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ اللَّجْلاجِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ)، فَقَالَ لِي: يَا مُحَمَّدُ؟ قُلْتُ: (لَبَّيْكَ وَسَعْديك)، قال: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (لَا أَدْرِي، فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قَالَ: قُلْتُ: (رَبِّي فِي الْكَفَّارَاتِ، وَالْمَشْيِ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ فِي الْمَكْرُوهَاتِ، وَانْتِظَارِ الصَّلاةِ إِلَى الصَّلاةِ فَمَنْ حَافَظَ عَلَيْهِنَّ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ وَكَانَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْم وَلدته امهِ).

٧٦ - عبد الله بن عباس دەڵێت: رسول الله ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارم بینی لە جوانترین وێنەدا، پێی فەرمووم: ئەی محمد؟ ووتم: ئەمرکە و جێبەجێی ئەکەم، فەرمووی: دەربارەی چی گفتوگۆ دەکەن مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان؟ ووتم: نازانم، دەستی لەنێوان شانم دانا هەستم بەساردی کرد لەنێوان مەمکەکانم، فێری عیلمی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بووم، فەرمووی: ئەی محمد ﷺ دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان؟ ووتم: دەربارەی الکفارات [ئەو کارانەی ئەبنە هۆی کەفارەتی تاوانەکان کە ئەنجا ئەیانژمێرێ:] بەپێ چوون بۆ نوێژی جەماعەت، وە دەستنوێژگرتن بەچاکی لەکاتە سەختەکاندا، وە چاوەڕێ بوونی نوێژ بۆ نوێژ، هەرکەس

پارێزگارییان لێبکات، لەســەر چاکە دەژی و لەســەر چاکەش دەمرێ، تاوانەکانی وەک ئەو ڕۆژەیە کە لەدایک بووە.

٧٧ - ثنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْعَبَّاسِ قَالَ: ثَنَا مَيْمُونُ بْنُ الأَصْبَغِ قَالَ: ثَنَا أَبُو مِسْهَرٍ عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ مِسْهَرٍ قَالَ: ثَنَا صَدَقَةُ بْنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ زَيْدِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ مَكْحُولٍ فَمَرَّ بِنَا خَالِدُ بْنُ اللجلاح فَدَعَاهُ مَكْحُول فَقَالَ: يَا ابا إِبْرَاهِيمُ، مَا حَدَّثَكَ بِهِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَيَّاشٍ الْحَضْرَمِيُّ قَالَ: قَالَ رَسُول اله ﷺ: (رَأَيْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فِي أَحْسَنِ صُورِهِ)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قَالَ: قُلْتُ: (أَي رب أَنْت أَفِي الْكَفَّارَاتِ)، قَالَ: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: (الْمَشْيُ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَي الْجَمَاعَاتِ، وَالْجُلُوسُ فِي الْمَسَاجِدِ خِلافَ الصَّلَوَاتِ، وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ أَمَاكِنَهُ فِي الْمَكَارِهِ، وَمِنَ الدَّرَجَاتِ: إِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَبَذْلُ السَّلامِ، وَأَنْ تَقُومَ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نيام، من فعل ذَلِك يعِيش بِخَير وَيَمُوت بِخَير وَيكون مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّه).

٧٧ - زید بن جابر دەڵێت: ئێمە لەگەڵ مکحول دا بووین خالد بن الجلاح بەلامان تێپەڕی، مکحول بانگی کرد و ووتی: ئەی أبا ابراهیم، عبد الرحمن بن عیاش الحضرمي چی بۆگێڕایتەوە؟

ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارم بینی لەجوانترین وێنەدا، فەرموویەتی: ئەی محمد دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان؟ ووتم: چ شتێک تۆ پەروەردگاری ئایا دەربارەی الکفارات؟ فەرمووی: ئەی ئەوە چییە؟ ووتم: بەپێ ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەماعەتەکان، وە دانیشتن لە مزگەوتەکان جیاواز لەکاتی

نوێژەکانیش، دەستنوێژگرتن بەجوانی لەکاتە سەختەکاندا، وە الدرجات بریتییە لە: خواردن بەخشین، وە بڵاوکردنەوەی سەلام، وە هەستان بەشەو لەکاتێکدا خەڵک خەوتوون، هەرکەسێک ئەمانە جێبەجێ بکات لەسەر خێر ئەژی و لەسەر خێریش ئەمرێت، وە تاوانەکانیشی وەک ئەو ڕۆژەی لێدێ کە لەدایک بووە.

٧٨ - ثنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِّ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: عُثْمَانَ بْنِ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: ثَنَا جَرِيرٌ، عَنْ لَيْثٍ، عَنِ عبد الرَّحْمَن بن سَابِطٍ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ؟ قُلْتُ: (لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ)، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (لَا أَدْرِي، قَالَ: فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ كَتِفَيَّ، فَعَلِمْتُ فِي مَقَامِي مَا سَأَلَنِي عَنْهُ مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ).

٧٨ - أبي أمامة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارم بینی لەجوانترین وێنەدا، فەرمووی: ئەی محمد؟ ووتم: فەرمانبکەو جێبەجێی بکەم، فەرمووی: دەربارەی چی مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان گفتوگۆ دەکەن؟ ووتم: نازانم، فەرمووی: دەستی لەنێوان مەمکەکانم دانا هەستم بەساردی کرد لەنێوان شانەکانم، لە شوێنی خۆمدا فێری کردم دەربارەی ئەو پرسیارانەی لێم ئەکات لە کاروباری دین و دنیادا.

٧٩ - ثنا أَحْمد، ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُــــلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بن يحيى بن العياض قَالَ: ثَنَا يُوسُـــفُ بْنُ عَطِيَّةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحوه.

٨٠ - قال ثَنَا احْمَد قَالَ: قرىء عَلَي أَبِي الأَحْوَصِ مُحَمَّدِ بْنِ الْهَيْثَمِ الْقَاضِـــي وَأَنَا أَسْـــمَعُ قَالَ: ثَنَا مُوسَـــى بْنُ مَرْوَانَ الرَّقِّيُّ قَالَ: ثَنَا الْمُعَافَى بْنُ عِمْرَانَ قَالَ: ثَنَا الأَوْزَاعِيُّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ أَنَّهُ سَمِعَ خَالِدَ بْنَ اللَّجْلاجِ يُحَدِّثُ مَكْحُولا عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَيَّاشٍ الْحَضْـــرَمِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ)، فَذَكَرَ أَشْيَاءَ وَكَانَ فِيمَا ذَكَرَ، قَالَ: قُلْتُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْـــأَلُكَ الطَّيِّبَاتِ' وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ وَحُبَّ الْمَسَـــاكِينِ، وَأَنْ تَتُوبَ عَلَيَّ، وَإِذَا أَرَدْتَ أَوْ دُرْتَ فِتْنَةً فِي قَوْمٍ فتوفيني غير مفتون).

٨٠ - عبد الرحمن بن يزيد بن جابر دەڵێت: بیســـتم خالد بن اللجلاج فەرموودەی بۆ مکحول گێڕایەوە لە عبد الرحمان بن عياش الحضـــرمي لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموويەتی: پەروەردگـارم بینی لە جوانترین وێنەدا باسـی هەنێک شـتی کرد لەوانەی کە باسـمان کرد، فەرموويەتی: ووتم: خوایە داوای شـــتە پاکەکانـت لێ ئەکەم، وە وازهێنـان لە خراپەکـان و خۆشـويسـتنی هەژارەکان، وە لێم خۆش بیت، ئەگەر ویسـتت کەسـانێک تاقی بکەیتەوە و توشـی فیتنەیان بکەیت بم مرێنە پێش ئەوەی توشـی فیتنە بم.

٨١ - حَدثنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مُوسَى الأَنْصَارِيُّ قَالَ: ثَنَا الْوَلِيد بِمَ مُسْلِمٍ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ بْنِ جَابِرٍ قَالَ حَدَّثَنِي خَالِدُ بْنُ اللَّجْلاجِ قَالَ حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَيَّاشٍ الْحَضْرَمِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ)، فَقَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ فَقُلْتُ: (أَنْتَ أَعْلَمُ أَيْ رَبِّ، فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاءِ والارض).

٨١ - عبد الرحمن بن عياش الحضرمي دەڵێت: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: پەروەردگارم بینی لە جوانترین وێنەدا، فەرمووی: مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن؟
ووتم: تۆ زاناترینی ئەی پەروەردگار، دەستی دانا لەنێوان شانم هەستم بە ساردی کرد لەنێوان مەمکەکانم، فێری ئەوە بووم کە لە ئاسمان و زەویدایە.

٨٢ - ثَنَا احْمَدَ قَالَ: نَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ قَالَ: ثَنَا أَبِي عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ)، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ؟ فَقُلْتُ: (لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ)، قَالَ: هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الاعلى؟ قلت: (لا يَا رَبِّ، فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ الَّذِي سَأَلَنِي عَنهُ).

٨٢ - أبي هريرة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: پەروەردگارم لە جوانترین وێنەدا بینی، فەرمووی: ئەی محمد؟

ووتم: فەرمانبکەو جێبەجێی ئەکەم، فەرمووی: ئایا ئەزانی مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن؟ ووتم: نا ئەی پەروەردگارم، فەرمووی: دەستی دانا لەنێوان شانم هەستم بە ساردی کرد لەنێوان مەمکەکانم، فێری ئەوەی کردم کە دەربارەی پرسیاری لێکردم.

٨٣ - حَدَّثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا مَيْمُونٌ الأَصْبَغُ قَالَ: ثَنَا ابْن مَرْيَمَ ثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ صَالِحٍ، عَنْ أَبِي يَحْيَى، عَنْ أَبِي زَيْدٍ، عَنْ أَبِي سَلامٍ الأَسْوَدِ، عَنْ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: عنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (أَنَّهُ قَالَ جَاءَنِي رَبِّي فِي احسن صُورَة)، ذكر مِثْلَ حَدِيثِ سُفْيَانَ بْنِ وَكِيعٍ.

٨٣ - ثوبان مولی ی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: پەروەردگارم هات بۆلام لە جوانترین وێنەدا، باسی کرد وەک فەرمودەکەی سفیان بن وکیع.

٨٤ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا بِشْرُ بْنُ مُوسَى قَالَ: ثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَنْصُورٍ قَال: حَدَّثَنِي الْحَارِثُ بْنُ عُبيْدٍ الأَيَادِيُّ، عَنْ أَبِي عِمْرَانَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (بَيْنَا أَنَا قَاعِدٌ إِذْ أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَوَكَزَ بَيْنَ كَتِفَيَّ، فَقُمْتُ إِلَى الشَّجَرَةِ، فِيهَا مِثْلُ، وَكْرَتَيِ الطَّيْرِ فَقَعَدَ فِي احداهما، وَقَعَدْتُ فِي الأُخْرَى فَسَمَتْ وَارْتَفَعَتْ حَتَّى سَدَّتِ الْخَافِقَيْنِ، وَأَنَا أُقَلِّبُ طرفِي فرايت النُّورَ الأَعْظَمَ وَلَهُ دُونِي حِجَابٌ رفرفة الدّرّ والياقوت).

٨٤ - أنس بن مالك دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەکاتێکدا من دانیشتبووم جبريل هات بۆ لام، ئینجا دانەیەکی کێشا بە نێو شانمدا، جا هەستام بۆ لای دارەکە کە دوو شوێنی وەك هێلانەی باڵندەی تێدا بوو، ئینجا جبريل دانیشت لەلای دانەیەکیاندا و منیش دانیشتم لەوەی تریان، جا بەرزبۆوە و هەستا تاوەکو هەردوو ئاسۆی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای داپۆشی، جا لە شوێنی خۆم کە سوڕام گەورەترین نورم بینی، وە لەسەری پەردەیەك هەبوو مرواری و یاقوتی پێدا شۆڕبووبۆوە.

٨٥ - ثنا احمَد قَالَ: قرىء عَلَى أَبِي إِسْمَاعِيلَ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ وَأَنَا أَسْمَعُ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ عَبْدِ اللّهِ الأُوَيْسِيُّ قَالَ: ثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ بِلالٍ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللّه بن ابي مَرْيَم إِنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللّهِ ﷺ، يَقُولُ: (عَرَجَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى جَاءَ شَجَرَةَ الْمُنْتَهَى، وَدَنَا الْجَبَّارُ رَبُّ الْعِزَّةِ فَتَدَلَّى، حَتَّى كَانَ مِنْهُ قاب قوسين اوادنى).

٨٥ - أنس بن مالك دەڵێت: ئەو شەوەی شەوڕەوی بە پێغەمبەر ﷺ کرا، فەرمووی: جبريل بەرزی کردمەوە هەتاوەکو گەیشتە داری المنتهى، نزیک بۆوە الجبار پەروەردگاری بەعیزەت جا دابەزی هەتاوەکو نێوانمان بەقەدەر دوو کەوان بوو یا کەمتریش.

٨٦ - ثنا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللّهِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: ثَنَا النَّضْرُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: ثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ: ثَنَا مُوسَى قَالَ: سَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ

ابْــنِ عَــبَّــاسٍ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى﴾، قَالَ: نَظَرَ مُحَمَّدٌ إِلَى رَبِّهِ فِي خضرَة.

٨٦ - ابن عباس دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى﴾، دەڵێت: محمد ﷺ تەماشای پەروەردگاری کرد لە سەوزاییدا.

٨٧ - حَدثنَا احْمَد، ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَرْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ثَنَا أَبُو بِسْطَامٍ، عَنِ الضَّحَّاكِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى ﴿لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ ربه الْكُبْرَى﴾ قَالَ: رَآهُ عَزَّ وَجَلَّ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ مِنْ يَاقُوتٍ فِي رَوْضَةٍ خضراء.

٨٧ - الضحاک دەربارەی فەرمایشتی الله عز وجل: ﴿لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ ربه الْكُبْرَى﴾، دەڵێت: پەروەردگاری بینی عز وجل لەنێوانیان پەردەیەک هەبوو لە یاقوت لە باخێکی سەوزدا.

٨٨ - ثنَا احْمَد قَالَ: قرىء عَلَى أَبِي إِسْمَاعِيلَ وَأَنَا أَسْمَعُ قَالَ: ثَنَا عمر وبن خَلَفٍ قَالَ: ثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ دَرَّاجٍ أَبِي السَّمْحِ، عَنْ أَبِي الْهَيْثَمِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (أَتَانِي جِبْرِيلُ)، فَقَالَ: إِنَّ رَبِّي وَرَبَّكَ يَقُول: كَيفَ رفعت زكرك، قَالَ: قلت: (اللّه اعْلَم)، قَالَ: يَقُول: اذا ذكرت ذكرت معى.

٨٨ - أبي سـعيد الخدري دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جبريل عليه السـلام هات بۆلام وتی: پەروەردگاری من و تۆ دەفەرموێت: چۆن یادی تۆم بەرز کردەوە؟

وتم: اللّهّ زاناترە.

فەرمووی: ئەگەر یادی من کرا یادی تۆش ئەکرێت لەگەڵم.

٨٩ - ثَنَا احْمَد قَالَ: قرىء عَلَى ابْنِ چِبِي هِلالٍ، عَنْ نَبِيهِ بْنِ وَهْبٍ أَنَ كَعْبَ الأَحْبَارِ قَالَ: مَا مِنْ فَجْرٍ يطلع الانزل سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ مَلائِكَةِ اللّهِّ حَتَّى يحفو بِالْقَبْرِ فَيَضْـرِبُونَ بِأَجْنِحَتِهِمْ وَيُصَـلُّونَ عَلَى رَسُـول اله ﷺ حَتَّى إِذَا أَمْسَـوْا عَرَجُوا وَهَبَطَ مِثْلُهُمْ فَيَصْنَعُونَ مِثْلَ ذَلِكَ حَتَّى إِذَا انْشَقَّتِ الأَرْضُ خَرَجَ فِي سَبْعِينَ أَلْفًا مِنَ الْمَلائِكَةِ يُوَقِّرُونَهُ.

٨٩ - كعب الأحبار دەڵێت: هیچ بەیانیەك نییە کەهەڵبێت ئیللا حەفتا هەزار مەلائیکەت دادەبەزنە سـەر قەبرەکەی سـێبەری لەسـەر دەکەن و باڵەکانیان لێک دەدەن، و صـلاوات دەدەن لە سـەر رسـول الله ﷺ هەتا ئێوارە دێـت بەرز دەبنەوە هـاوشـــێوەی ئەو مەلائیکەتـانە دادەبەزێـت هەمان شـــتی ئەوان دوبارە دەکەنەوە هەتا ئەو کاتەی زەوی شـــەق دەبـات و [پێـغەمبەر ﷺ] دەردەچـێ حەفتـا هەزار مەلائـیکەت ڕێزی لێدەگرن.

٩٠ - ثَنَا أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُونُسَ قَالَ: ثَنَا قُرَيْشُ بْنُ أَنَسٍ قَالَ: ثَنَا كُلَيْبُ بْنُ وَائِلٍ قَالَ: غَزَوْنَا فِي صَدْرِ هَذَا الزَّمَانِ فَوَقَعْنَا فِي عَقَبَةٍ، فَإِذَا فِيهَا شَجَرَةٌ عَلَيْهَا وَرْدٌ أَحْمَرُ مَكْتُوبٌ فِيهِ بِالْبَيَاضِ: لَا إِلَهَ إِلا اللَّهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ.

٩٠ - كليب بن وائل دەڵێت: غەزامان کرد لە سەرەتای ئەم سەردەمەدا لە بەربەستێکدا وەستاین، دارێکی تیابوو گوڵێکی سوری بەسەرەوە بوو بە سپی لێی نوسرابوو: لا اله إلا الله محمد رسول الله.

٩١ - قَالَ ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْحَاقَ الْحَرْبِيُّ قَالَ: ثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ قَالَ: ثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أنبا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلابَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (أَتَانِي رَبِّي جَلَّ وَعَزَّ اللَّيْلَةَ فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ)، فَقَالَ: هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، قلت: (يختصمون فِي الْكَفَّارَاتِ: الْمكْث فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلَوَاتِ، وَالْمَشْيِ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، فَمَنْ يَعْمَلْ ذَلِكَ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ، وَكَانَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ امهِ).

٩١ - ابن عباس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: پەروەردگارم عز وجل شەوێکیان هات بۆلام لە جوانترین وێنەدا ، فەرمووی : ئایا ئەزانیت دەربارەی چی گفتوگۆ ئەکەن مەلائیکەتە بەرزەکانی ئاسمان؟

دەستی لەنێوان شانم دانا هەستم بەساردی کرد لەنێوان مەمکەکانم، فێری عیلمی نێوان زەوی و ئاسمانەکانی کردم، ووتم: دەربارەی

الكفارات كە: مانەوەیە لە مزگەوتەكان دوای نوێژەكان، وە بەپێ ڕۆشتن بۆ نوێژە جەماعەتەكان، وە دەستنوێژگرتن بەجوانی لەكاتە سەختەكاندا، هەركەس ئەمانە بكات لەسەر خێر ئەژی و لەسەر خێریش ئەمرێت، وە تاوانەكانی وەک ئەو ڕۆژەیە كەلەدایک بووە.

٩٢ - ثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: ثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: ثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ بَكْرٍ، عَنْ أَبِي قلابة ان النَّبِي ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَبِّي: هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: (لَا)، فَقَالَ: فِي الثَّانِيَةِ وَالثَّالِثَةِ، فَقُلْتُ: (نَعَمْ فِي ثَلاثٍ هِيَ ثَلاث كَفَّارَاتٍ وَثَلاثُ دَرَجَاتٍ، كَفَّارَاتٌ: بَنِي آدَمَ إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكْرُوهَاتِ، وَنقل الاقدام الي الْجَمَاعَات، وانتظار الصَّلَاة بعد الصَّلَاة).

٩٢ - أبي قلابة دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: الله عزوجل پێی فەرمووم: ئایا ئەزانی دەربارەی چی گفتوگۆ ئەكەن مەلائیكەتە بەرزەكانی ئاسمان، ووتم: نەخێر،
پێی فەرمووم لە دووەم جار و سێیەم جاردا،
ووتم: بەڵێ دەربارەی سێ دانەكە ئەوەش سێ دانەكەی الدرجات و الكفارات ـە، الكفارات ـی نەوەی آدم بریتییە لە: دەستنوێژگرتن بەجوانی لە كاتە سەختەكاندا، وە هەنگاونان بەرەو نوێژی جەماعەتەكان، وە چاوەڕوانكردنی نوێژ بۆ نوێژ.

٩٣ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْـحَاقَ قَالَ: ثَنَا مُوسَـى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: ثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ مطر فِي آخَرين مثله.

٩٤ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ سَـعِيدٍ، عَنِ ابْنِ عَجْلانَ قَالَ: حَدثنِي ابي قَالَ: سَـمِعت ابا هُرَيْرَة، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى نَفْسِـهِ بِيَدِهِ لَمَّا خلق الْخلق: ان رحمتى تغلب غَضَبي).

٩٤ - أبي هريرة دەڵێت: لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی الله عزوجل لەسـەر نەفسـی خۆی نوسـیوە بەدەسـتی خۆی کاتێك کە دروستکراوەکانی درووست کرد: ڕەحمەتم زاڵە بەسەر تورەِ بوونم ـدا.

٩٥ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عبد اله بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ قَالَ: أَنْبَأَ الْجَرِيرِيُّ، عَنْ أَبِي عطاف قَالَ: كتب اللّه عزوجل التَّوْرَاةَ لِمُوسَـى بِيَدِهِ فِي الأَلْوَاحِ، مِنْ دُرٍّ يُسْـمَعُ صَـرِيفُ الْقَلَمِ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ إِلا الْحِجَابُ.

٩٥ - أبی عطاف دەڵێت: الله عزوجل بەدەسـتی خۆی تەوڕاتی بۆ موسی نوسی، لە لەوحـێکی مرواریدا، گوێی لە خشەی قەڵەمەکە بوو لە نێوان ئەو و ئەودا [الله] هیچ شتێك نەبوو جگە لە پەردەیەک.

٩٦ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ احْمَد قَالَ: حَدثنِي عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: ثَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ كَعْبٌ: كَتَبَ اللّهُ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ.

٩٦ - كعب دهڵێت: الله عز وجل بهدهستى خۆى تهوڕاتى نوسى.

٩٧ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى أَبِي قَالَ: ثَنَا اسحاق ابْن سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْجُنَيْدِ شَيْخٌ كَانَ عِنْدَنَا، عَنْ جَعْفَرِ بن الْمُغِيرَةِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ الأَلْوَاحَ مِنْ يَاقُوتَةٍ لَا أَدْرِي قَالَ: حَمْرَاءَ اولا وَأَنَا أَقُولُ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ يَقُولُ: إِنَّهَا كَانَتْ مِنْ زُمُرُّدٍ، وَكِتَابُهُ الذَّهَبُ، وَكَتَبَهَا الرَّحْمَنُ بِيَدِهِ، وَسَمِعَ اهل السَّمَوَات صرف الْقَلَم.

٩٧ - له جعفر بن أبى المغيرة، له سعيد بن جبير: ئهوان دهڵێن ألواح له ياقوته - نازانم ووتى: سوره يان نا، وه من دهڵێم: سعيد بن جبير دهڵێت: بهڵكوو له زمرِوت بوو [بهردێكى گران بههايه]، وه نوسيهنهكانى ئاڵتوون بوو، وه الرحمن عزوجل بهدهستى خۆى نوسى، وه ئههلى ئاسمانهكان گوێيان له خشهى قهڵهمهكه بوو.

٩٨ - حَدثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى أَبِي ثَنَا ابْنُ نُمَيْرٍ قَالَ: ثَنَا اسماعيل يَعْنِي بن أَبِي خَالِدٍ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: أُخْبِرْت أَنَّ اللّهَ خَلَقَ آدَمَ بِيَدِهِ، وَكَتَبَ التَّوْرَاةَ لِمُوسَى، قَالَ: أَبِي وَثنا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ.

٩٨ - حكيم بــن جابر دەڵێت: هەواڵم پێدرا کەوا الله عز وجل آدم ــی بەدەستی خۆی دروستکردووە، وە تەوڕاتی بەدەستی خۆی نوسی.
باوکم وتی محمد بن عبید بۆی گێڕاینەوە بەهەمان ئیسناد و مەعنا.

٩٩ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى أَبِي حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْحَكَمِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَمَسَّ بِيَدِهِ إِلا ثَلاثًا خَلَقَ آدم، بِيَدِهِ وَغَرَسَ الْجَنَّةَ بِيَدِهِ وَكَتَبَ التَّوْرَاة بِيَدِهِ.

٩٩ - عکرمة دەڵێت: بەڕاستی الله دەستی لەهیچ شتێک نەداوە جگە لە سێشت نەبێت، آدم ــی دروستکرد بەدەستی خۆی، وە بەهەشتی چاند بەدەستی خۆی، وە تەوڕاتی نوسی بەدەستی خۆی.

١٠٠ - ثنا احمد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا أَبُو الْمُغِيرَةِ قَالَ: ثَنَا عَبْدَةُ، عَنْ أَبِيهَا خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَمَسَّ بِيَدِهِ إِلا آدَمَ خَلَقَهُ بِيَدِهِ، وَالْجَنَّةَ وَالتَّوْرَاةَ كَتَبَهَا بِيَدِهِ، قَالَ: وَدَمْلَجَ اللَّهُ لُؤْلُوَةً بِيَدِهِ فَغَرَسَ فِيهَا قُضْـــبَانَهَا، فَقَالَ، لَهَا امْتَدِّي حَتَّى أَرْضَـــى، وَأَخْرِجِي مَا فِيكِ بِإِذْنِي، فَأَخْرَجَتِ الانهار والبحار.

١٠٠ - خالد بن معدان دەڵێت: بەڕاستـی الله دەستی نەداوە لە هیچ شتێك ئیلا ئادەم نەبێت دروستی کرد بەدەستی خۆی، وە بەهەشت، وە تەوڕاتی نوســی بەدەســتی خۆی، ووتی: وە الله عزوجل بەدەستی خۆی مرواریەکانی تێکەڵ کرد، جا دارێکی تێدا چاند، فەرمووی: درێژ ببە هەتا

ڕازی دەبم، وە ئەوەی لە تۆ دایە دەری بهێنە بە ئیزنی من، جا ڕووبارەکان و دەریاکانی لێ هاتەدەر.

١٠١ - ثَنَا احمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ احمَد قَالَ: حَدَّثَنِي حُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ مُطَرِّفٍ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: إِنَّ اللّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لَمَّا كَتَبَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ، قَالَ: بِسْمِ اللّهِ هَذَا كِتَابُ اللّهِ بِيَدِهِ لِعَبْدِهِ مُوسَى، يُسَبِّحُنِي وَيُقَدِّسُ لِي، وَلا يَحْلِفُ بِاسْمِي آثِمًا فَإِنِّي لَا أُزَكِّي مَنْ حَلَفَ بِاسْمِي آثِما.

١٠١ - زيد بن أسلم دەڵێت: بەڕاستی الله تبارک وتعالی کاتێك تەوراتی نوسی بەدەستی خۆی فەرمووی: بسم الله ئەمە کتابی اللەیە بە دەستی خۆی بۆ بەندەکەی موسى، بۆ ئەوەی تەسبیحاتم بکات وپیرۆزم ڕابگرێت، وە سوێند مەخۆ بەناوی من بەدرۆوە چونکە من کەسێك پاك ناکەمەوە کە سوێند بخوات بەناوی من بەدرۆوە.

١٠٢ - قثنا احمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا هَنَّادُ بْنُ السَّرِيِّ قَالَ: ثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَن عَطاء، عَن ميسر فِي قَوْلِ اللّهِ عَزَّ وَجَلّ لِمُوسَى ﴿وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا﴾ [مَرْيَم ۝٥٢] قَالَ: أُدْنِيَ حَتَّى سَمِعَ صَرِيفَ الْقَلَمِ فِي الأَلْوَاحِ وَكَتَبَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ.

١٠٢ - لە عطاء ـەوە، لە ميسرة ـەوە، دەربارەی فەرمایشتی الله عزوجل بۆ موسى ﴿وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا﴾ [مَرْيَم ۝٥٢] دەڵێت: نزیك کرایەوە هەتا

گوێی لەدەنگی قەلەمەکە بوو لەسەر لەوحەکان، وە تەوڕاتی بەدەستی خۆی بۆ نوسی.

١٠٣ - قثنا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا أَبُو الْحَسَنِ بْنُ الْعَطَّارِ مُحَمَّدُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جَعْفَرٍ الأَنْصَارِيَّ قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ عُبَيْدٍ وَكَانَ مِنْ خِيَارِ النَّاسِ، يَقُولُ: رَأَيْتُ أَحْمَدَ بْنَ نَصْرٍ فِي الْمَنَامِ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ مَا صَنَعَ بِكَ رَبُّكَ جَلَّ وَعَزَّ، فَقَالَ: غَضِبْتُ لَهُ فَأَبَاحَنِيَ النَّظَرَ إِلَى وَجْهِهِ.

١٠٣ - أبا جعفر الأنصارى دەڵێت: گوێم لە محمد بن عبيد بوو وە ئەو لە چاكترینی خەڵكی بوو، دەیوت: أحمد بن نصرم بینی لە خەودا پێم وت: ئەی أبا عبد الله پەروەردگارت عزوجل چی لەگەڵدا كردیت؟

ووتی: بەپەرۆش بووم بۆ بینینی، جا ڕێگەی پێدام كە بڕوانم بۆ ڕوخساری.

١٠٤ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ قَالَ: ثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴿أَنْ بُورِكَ من فِي النَّارِ﴾ قَالَ اللّه ﴿وَمن حولهَا﴾ قَالَ: الْمَلَائِكَة.

١٠٤ - إبن عباس دەربارەی فەرمايشـــتی الله عز وجل: ﴿أَنْ بُورِكَ من فِي النَّارِ﴾ دەڵێت: واته اللّه، ﴿وَمن حولهَا﴾ واته مەلائيكەتەكان.

١٠٥ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْـــحَاقَ الصَّـــاغَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي هَوْذَةُ بْنُ خَلِيفَةَ قَالَ: ثَنَا عَوْفٌ، عَن وردان بن ابي خَالِدٍ قَالَ: خَلَقَ اللّهُ آدَمَ بِيَدِهِ، وَخَلَقَ جِبْرِيلَ، وَخَلَقَ عَرْشَـــهُ بِيَدِهِ، وَخَلَقَ الْقَلَمَ بِيَدِهِ، وَكَتَبَ التَّوْرَاةَ بِيَدِهِ، جَلَّ وَعَزَّ وَكَتَبَ الْكِتَابَ الَّذِي عِنْدَهُ مَا يَطَّلِعُ عَلَيْهِ غَيْرُهُ بِيَدِهِ.

١٠٥ - وردان بـــن أبـــی خـــالـــد دەڵێت: الله عـــزوجـــل ئـــادەمـــی دروستكردووە بـــە دەســـتـــی خـــۆی، وە جبريل عليه السلام ـی دروستكردووە، وە عەرشـــی دروســـتكرد بە دەســـتی خۆی، وە قەڵەمی دروســـت كرد بە دەستی خۆی، وە تەوراتی نوسی بەدەستی خۆی، وە ئەو كتابەی لەلای خۆیەتی بێجگە لە خۆی كەســـی تر ناتوانێت ببينێت، بە دەســـتـی خۆی نوسی.

١٠٦ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ مُحَمَّد بن عمر ابْن الْحَكَمِ أَبُو الْحَسَنِ الْعَطَّارِ قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ زِيَادٍ سَبَلَانُ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَهْدِيٍّ مَا تَقُولُ فِيمَنْ يَقُولُ الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ؟ قَالَ: لَوْ كَانَ لِي عَلَيْهِ سُـلْطَانٌ لَقُمْتُ عَلَى الجسـر، لايمر بِي رَجُلٌ إلا سَـأَلْتُهُ، فَإِذَا قَالَ: الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ ضَرَبْتُ عُنُقَهُ وَأَلْقَيْتُ رَأْسَهُ فِي الْمَاءِ.

١٠٦ - ابراهيم بن زياد سـبلان دەڵێت: پرسـيارم كرد لە عبدالرحمن بن مهـدي وتم: چی دەڵێيـت دەربـارەی ئەوەی كە دەڵێـت قورئـان مەخلوقە؟

ووتی: ئەگەر دەسـەڵاتم هەبووايە: لەسـەر پردێك دەوەسـتام، جا هيچ پياوێك بەلامدا تێنەدەپەڕی ئيلا پرسيارم لێ دەكرد [دەربارەی قورئان]، جـا ئەگەر وتـی: قورئـان مەخلوقە، لە مليم دەدا، وە سـەرەكەيم هەڵدەدايە ناو ئاوەكەوە.

١٠٧ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: ثَنَا أَبُو الْحَسَـنِ بْنُ الْعَطَّارِ قَالَ: سَـمِعْتُ أَبَا نُعَيْمٍ الْفَضْـلَ بْنَ دُكَيْنٍ يَقُولُ: وَذَكَرْتُ عِنْدَهُ مَنْ يَقُولُ: الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا سَمِعْتُ شَيْئًا مِنْ هَذَا حَتَّى خَرَجَ ذَلِك الْخَبِيث: جهم.

١٠٧ - أبو حسـن بن العطار محمد بن محمد وتـی: گوێم لە أبا نعيم الفضـل بن دكين بوو دەيوت: باسـكرا لەلای ئەوەی كە دەڵێت: قورئان مەخلوقە،

جا ووتی: والله هيچ شتێك لەمەم نەبيستبوو، هەتا ئەم پيسە دەركەوت: جەهم.

١٠٨ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْحَسَنِ بْنُ الْعَطَّارِ قَالَ: سَـمِعْتُ إِبْرَاهِيمَ بْنَ زِيَادٍ سَـبَلَانَ يَقُولُ: سَـمِعْتُ الضَّـرِير -مُحَمَّد بن حَازِم-

يَقُولُ: الْكَلامُ فِيهِ بِدْعَةٌ وَضَــــلالَةٌ وَمَا تَكَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ وَلا الصَّـــحَابَةُ وَلا التَّابِعُونَ وَلا الصَّالِحُونَ -يَعْنِي الْقُرْآنُ مَخْلُوق-.

١٠٨ - الضـــرير -محمد بن خازم- دەڵێت: قســـەكردن تێيدا بيدعە و گومڕاييە، وە نە پێغەمبەر ﷺ قســـەی تێداكردوە، وە نە هاوەڵان، وە نە تابعين، وە نە پياوچاكانيش، -واتە : هيچ يەكێكيان نەيان وتووە قورئان مەخلوقە-.

١٠٩ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْحَسَـــنِ قَالَ: سَـــمِعْتُ هَـارُونَ بْنَ مَعْرُوفٍ يَقُولُ: مَنْ زعم ان اللّه لايتكلم، فَهُوَ يعبـد الاصنام.

١٠٩ - هارون بن معروف دەڵێت: هەركەســـێک پێی وابێت كەوا الله قسە ناكات، ئەوە بتەكان ئەپەرستێت.

١١٠ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللَّهِّ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْحَسَنِ بْنُ الْعَطَّارِ قَالَ: سَـمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مُصْـعَبٍ الْعَابِدُ يَقُولُ: مَنْ زعم انك لاتتكلم وَلا تُرَى فِي الآخِرَةِ، فَقَدْ كَفَرَ بِوَجْهِكَ، وَلا يَعْرِفُكَ أَشْـهَدُ أَنَّكَ فَوْقَ الْعَرْشِ فَوْقَ سَـبْعِ سماوات، أَنْ لَيْسَ كَمَا يَقُولُ أَعْدَاءُ اللَّهِّ الزَّنَادِقَةُ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِّ.

١١٠ - محمد بن مصعب عابد دەڵێت: هەركەسێك پێی وابێت كە تۆ [الله] قـسـە ناكەيت و وە نابينرێيت لـە ئاخيرەت ـدا، ئەوە كافرە بە ڕووی تۆ، وە تۆ ناناســێت، من شـــايەتی دەدەم كە تۆ لەســـەرووی عەرشـــيت،

لەسەروی حەوت ئاسمانەکەیت، نەك وەك ئەوەی دوژمنە زەندیقەکانی الله دەیڵێن لەعنەتی الله ـیان لێبێت.

١١١ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الْحَسَنِ بْنُ الْعَطَّارِ قَالَ: سَمِعْتُ هَارُونَ بْنَ مُوسَى الْفَرْوِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ عبد اللّه بْنَ الْمَاجِشُونِ يَقُولُ: مَنْ قَالَ الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ: فَهُوَ كَافِرٌ، وَسَمِعْتُهُ -يعْنى عبد اللّه- يَقُولُ: لَوْ وَجَدْتُ الْمَرِيسِيَّ لَضَرَبْتُ عُنُقَهُ.

١١١ - هارون بن موسى الفروي دەڵێت: بیستم عبد الله بن الماجشون دەیوت: هەرکەسێك بڵێت: قورئان مەخلوقە کافرە، وە گوێم لێی بوو -واتە عبد الله- دەیوت: ئەگەر المریسی ـم بدۆزیایەتەوە ئەوا دەمدا لەملی.

١١٢ - ثَنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ قَالَ: ثَنَا أَبُو الْحَسَنِ بْنُ الْعَطَّارِ قَالَ: قَالَ لِيَ الْفَضْلُ بْنُ دِينَارٍ الْعَطَّارُ وَأَثْنَى عَلَيْهِ خَيْرًا قُلْتْ: لِبَعْضِهِمْ -يَعْنِي الْجَهْمِيَّةَ- وَيْحَكَ أَلا تَذْهَبُ إِلَى الْجُمُعَةِ، قَالَ: بَلَى اوذا أَذْهَبُ مَعَكَ الْيَوْمَ، قَالَ: فَلَمَّا رَجَعَ، قَالَ: قَدْ ذَهَبْنَا إِلَى الْجُمُعَةِ فَصَلَّيْنَا فَكَانَ أَيْشٍ، قَالَ أَبُو الْحَسَنِ: ثُمَّ قَالَ لِيَ الْفَضْلُ: يَا أَبَا الْحَسَنِ هُمْ زنادقة.

١١٢ - أبو حسن بن العطار وتی: بە منی وت فضل بن دینار العطار وە پیای هەڵدا بەچاکە: وتم بە هەندێك لەوان -واتە هەندێك لە جەهمیەکان- تیاچوون بۆ تۆ، ئایا ناڕۆیت بۆ جومعە؟

وتی: بەڵێ، ئەوە ئەمڕۆ لەگەڵت دێم،

وتی: کاتێك گەڕایەوە، بەمنی وت: ئەوە ڕۆشـــتین بۆ جومعە و نوێژمان کرد، جا چی بوو؟!

أبو حسن وتی: پاشان فضل بە منی وت: ئەی أبا حسن، ئەوانە زەندیقن.

١١٣ - ثنَا احْمَد قَالَ: ثَنَا عَبْدُ اللّهِ قَالَ: ثَنَا أَبُو الْحَسَنِ قَالَ: سَمِعْتُ سُرَيْجَ بن النُّعْمَان يَقُول: سَـــمِعت عَبْدَ اللّهِ بْنَ نَـافِعٍ، وَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ قِبَلَنَا مَنْ يَقُولُ: الْقُرْآنُ مَخْلُوقٌ، فَاسْـتَعْظَمَ ذَلِكَ وَلَمْ يَزَلْ مُوجَعًا حَزِينًا يَسْـتَرْجِعُ، قَالَ: عَبْدُ اللّهِ بْنُ نَـافِعٍ، قَـالَ مَـالِكٌ: مَنْ قَـالَ: الْقُرْآن مَخْلُوق يحبس حَتَّى يعلن مِنْهُ تَوْبَةٌ، وَقَالَ مَالِكٌ: الإِيمَانُ قَوْلٌ وَعَمَلٌ وَيَزِيدُ وَيَنْقُصُ، وَعِلْمُهُ فِي كُلِّ مَكَانٍ لَا يَخْلُو من علمه شَيْء.

١١٣ - سـريج بن نعمان دەڵێت: بيسـتم لە عبدالله بن نافع، وە پێم وت: لەلای ئێمە کەسانێك هەن دەڵێن: قورئان مەخلوقە،

ئەمەی بەگەورە زانی و ئازار و دڵتەنگی لێنەبڕا، گەڕايەوە.

عبدالله بن نافع ووتی: مالك ووتی: هەرکەسـێك بڵێت قورئان مەخلوقە، تەمێ دەکرێت و سجن دەکرێت هەتا تەوبەکەی لێوە ئاشکرا دەبێت.

وە مالك وتی: ئیمان وتە و کردارە، زیاد دەکات و کەم دەکات.

وە مالك وتی: الله لە ئاسـمانە و عیلمەکەی لە هەموو شـوێنێکە، هیچ شوێنێك لە عیلمی ئەو خاڵی نیە.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين وصلى الله وسلم
وبارك على نبينا وحبيبنا محمد صلى الله عليه وآله
وصحبه أجمعين.